# بەهای ئافرەت

## لە ئاینی ئیسلامدا
## لەئاینەکانی تر
## لەمێژوودا
## لە وڵاتە پێشکەوتووەکان



نووسینی
عبدالله دارا
مەبەست نەوزاد

بەهای
ئافرەت
لەئاینی
ئیسلامدا

# ناوەڕۆکی کتێب

# چۆن باشتر لەم کتێبە تێبگەم؟

خوێنەری ئازیز ، ئەم کتێبە ئیسپاتی ئەکات کە
ئاینی ئیسلام ڕاستە و بەهای بە ئافرەت بەخشیووە بەهەموو
بەڵگەیەکی ئاینی و فکری و مێژوو و ئامار و زانست ، سەرەتای
کتێبەکە باسی ئاینەکانی تر و کۆمەڵگا و وڵاتە نا ئیسلامیەکان
ئەکات کە چەندە ئافرەتیان زەلیل کردووە و لە لاپەڕەکانی نزیک
کۆتای باسی ئاینی ئیسلام دەکات کە چۆن لە ئافرەت ئەڕوانێت چۆن
لە خوشک و دایک و کچ و هاوسەر ئەڕوانێت و ئایە ئاینی ئیسلام
تۆی ئافرەتی بەکوێ گەیاند و چ مافێکی پێ بەخشیوی و بوونی تۆ
چیە و چۆن باسکراوە .. گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە
هەم لەڕووی ئاینی هەم لە ڕووی فکری بەبەڵگە و ئەیسلەمێنێت
کە ئافرەت چەندە بوونێکی گەورەیە و ئیسلامیش چەندە ئاینێکی
ڕاستە ،
لەم کتێبەدا باس لەوە کراوە کە ئاین و ژیارەکانی تر چۆن
ئافرەتیان بێ دەسەڵات کردووە ( بە بەڵگەی کتێبە پیرۆزەکانی
خۆیان ) وە باس لە دڕندەی وڵاتان و کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان
ئەکات
( هەمووی بە ئاماری باوەڕ پێکراو و سەرچاوەکانیش لەکۆتایدا
باسکراون )
ئەوسا دێینە باسی ئاینی ئیسلام کە بزانین
لەبەرامبەر ئەو مێژوە خوێناوییەی ئافرەت و ئەو هەموو وڵاتە بەناو
پێشکەوتووانە و ڕێکخراوەکانی ئافرەت و فێمینیزم و جێندەر بزانین
ئیسلام چی کردووە ؟؟؟ هەڵبەتە
بەسەرچاوە ڕاستەقینەکانی ئاینی ئیسلام کە پێک هاتوون لە
قورئان و فەرموودە ،
ئینجا بزانم کام مولحید توانای وڵام دانەوەی ئەم کتێبەی هەیە ؟؟

# پێشەکی

بەناوی پەروەردگاری تاکو تەنها و بێهاوتا، خاوەنی ناوی جوان و سیفاتی بەرز، بەناوی ئەو زاتەی کە زانستی ئەزەلیە و واجبە بۆ وجودی هەموو مەوجودێك، قەدەری داناییە و قەزای دادوەری. درووود و سڵاو بۆ گیانی پاکی پەیامبەر و خانەوادە و هاوەڵانی و ئەوانەشی تا ڕۆژی دوایی شوێنیان دەکەون بەحەق.

بەڕێزان جێی باسە ئەم کتێبە بەرهەمی دەیان شەونخوونی و گەڕانی دوو نوسەرن ، کە بەنیەتێکی پاکەوە ئەم کتێبەیان نووسیووە تا گەشتووە بەدەستی تۆی خوێنەری بەڕێز ،
کە مەبەستمان گەیاندنی پەیامی خودایە وەک خۆی ، تاکە کتێبێکیش کە هەڵەی تێدانەبێت قووڕئانە..
دەکرێت ئێمە هەڵەمان کردبێ
. هەرچی هەڵەیەکی تێدابوو ئەوا لەمن و شەیتانەوەیە وە هەر جوانیەکیشت تێیدا بینی ئەوە جوانی خودای پەروەردگارە ، لەم کتێبە باشترین دیزاین بەکار هاتووە کە لەهیچ کتێبێکی PDF لەکوردا نەبووە پێشتر ، تەنانەت ئەو ڕەنگەی کە لە پەڕەی کتێبەکەدا بەکارهاتووە لەڕووی زانستیووە چاوی تۆی ئازیز ئەزیەت نادا ، تەنها لەپێناو ئەوەی کە هەق بدەین بەبابەتەکە زۆر بەوردی و درشتی گەڕاوین بە قورئان و فەرمودە و کتێبە ئاینیەکانی تر و ئامارە جیهانیەکان و مێژوو سەبارەت بە بەهای ئافرەت
لێرەوە داوا لەخوودای جیهانیەکان دەکەم ، خودای من بەگەورەی خۆت بمبەخشە و ئەم کتێبەم ڕیای نەبێت بۆ ناوبانگمان و خۆ دەرخستنمان نەبێت ، بەڵکوو لەپێناوی پەیامەکەی تۆدابێ و بەس ، لەگوناهی ئێمە و خوێنەرانیش خۆشبە خودای جیهانیەکان..
لەم کتێبەدا کۆکردنەوەی زانیاریی و ڕاڤە کردنێکی سادەیە و هەرکاتێکیش بابەتێکی خۆمی تێدابوو بەمەبەستی ڕونکردنەوەی هەندێك لە دەقەکاندایە کە بۆ ئەوەش سودم لە کتێبەکان وەرگرتووە.

# تێبینی*

تێبینی/ هەر باسێکی دینی لەم پەرتووکە سەرچاوەی قورئان و فەرموودەیە وە ئاماژە بەسەرچاوەکەی کراوە لەتەنیشت خۆیەوە
هەر ئامارێکی وڵاتانیش باس کرابوون ئەوە لەکۆتای کتێبەکەوە پەڕەیەکمان تایبەت کردووە بەسەرچاوەکان تاوەکوو خوێنەر نەکەوێتە دوودڵی لە ڕاستی و دروستی بابەتەکە.

لەگەڵ ڕێزی نووسەران
عبدالله دارا مامڵێسی
مەبەست نەوزاد

## بەهای ئافرەت پێش هاتنی دینی ئیسلام

لەساڵی 586 زاینی ، کۆنگرەیەک بەسترا کە ئایا ئافرەت ڕۆحی هەیە یاخوود نا ، ئەگەر ڕۆحیشی هەبێت ئایا ڕۆحێکی مرۆڤانەیە یان ڕۆحێکی ئاژەڵانە! لەکۆتایدا هەمویان ڕێککەوتن کە بەڵێ ڕۆحی هەیە بەڵام ڕۆحێکی زۆر نزم کە بۆ خزمەتی هەوەسی پیاو دروست کراوە،
وە تەواوی مێژوو سەلماندوویەتی کە پێش هاتنی ئاینی ئیسلام ئافرەتان زیندە بەچاڵ کراون
لەبەر ئەوەی کە پێیان وابوو کە ئافرەت جگە لەسەر شۆڕی شتێکی تر نییە ، وە بەبەردەوامی ئافرەتانیان زیندە بەچاڵ دەکرد (بەزیندووی ئەیان کردنە گۆڕەوە) ، شایەنی باسە بەدیاریکراوی ئەم کاتە کە تۆی خوێنەر ئەم کتێبە ئەخوێنیتەوە 127 وڵات ڕێکەوتنی ساڵانەو مانگانەیان هەیە لە هەناردەکردنی ئافرەت.
کە تێیدا بەتایبەت وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا و ئەفریقا. وە ئەو ئافرەتانەی کە بازرگانیان پێوە ئەکرێت لەنێوان وڵاتاندا بەڕێژەی سەدا 88 بۆ مەبەستی لەشفرۆشی دەنرێدرێن و ڕێژەی سەدا 12 وەک خزمەتکار مامەڵەی لەگەڵ دەکەن ،
وە بەر لەهاتنی ئیسلام لەهەموو وڵاتان وا باوبوو
کە ئافرەت ئاژەڵێکی زۆر نزمە ، بۆنموونە لەهندستان ڕۆڵی ئافرەت لە ماڵ و خێزاندا تەنها خزمەتکار بوو و وە زۆریش ئاسای بوو ئەگەر تۆ خوشک و دایک و کچی و ژنی خۆت لەقوماردا بدۆڕێنی یاخوود بەدیاری بیدەی بەهاوڕێیەکت
وە ئەگەر پیاوەکەشی بمردبا ژنەکەیان دەسووتان ئەمە نەریتێکی هەمیشەییان بوو ،

بۆنموونە لەوڵاتێکی وەک چین یاسا دەسەڵاتی دابوو بەپیاو کە ئافرەت بەزیندووی بکەنە گۆڕەوە ئەگەر بەقسەی نەکردن ، وە پیاوانی کڵێسە بەهەموو شێوازێک دەیان وت ئافرەتان موڵکی ئێمەن و باسی مافی ئافرەتیش مەکەن ئافرەت دەبێ بەو شێوازەبێ کە پیاوانی کڵێسە ئەیانەوێ . وە هەر پیاوێکیش خێزانەکەی خۆی بە زینا تاوان بار بکردایە هەتا ئەگەر بەڵگەشی نەبوایە دەیتوانی ئافرەتەکەی خۆی بەو شێوازە بکوژێ کە خۆی دەیویست هیچ یاسا و دەستوور و مافێکیش بۆی نیە دەستی بگرێ ، وە جولەکە و نەسرانیش ئافرەتیان بەهۆکاری نەزانی لەقەڵەم داوە لەبەر ئەوەی ئافرەت هۆکاری دەرکردنی ئادەم بووە لەبەهەشت ،
لە ئینجیلدا هاتووە ئادەم دەڵێت : ئەو ئافرەتەی کە لەگەڵ منا داتاننا هۆکار بوو بۆ ئەوەی لەدارەکە بخۆم (سفر التكوين 3-12)
وە لای کریستیەنەکانیش هەمان بیرکردنەوە هەیە ، وە بەر لەهاتنی لەهاتنی ئیسلام ئافرەتان لەگەڵ خراپترین جۆری مامەڵەی پیاوبون ، دەکوژران ، زیندە بەچاڵ دەکران ، دوای مردنی پیاوەکەی یان دەسووتا یانیش دەبوو بۆ هەمیشەی خزمەتکارێکی بەکەم سەیرکراوبێ.

لەجولەکەشدا بەهیچ شێوازێک لەدادگا قسەی ئافرەت کاری پێنەدەکرا.
جان جاک ڕۆسۆ دەڵێت : ئافرەت بۆ ئەوە دروست نەکراوە کە فێری زانست و حیکمەت و هونەری قسەکردن بێت ، لەکاتێکدا خوای پەروەردگار
فێربوونی زانستی بەسەر پیاو و ئافرەت فەرز کردوەو وئافرەتی وەک حیکمەتێکی زۆر گەورە لەقورئاندا باسکردووە ، بەڵام لەکتێبی موقەدەسدا هاتووە کە ئافرەت بۆی نیە زاری بکاتەوەو قسە بکا لە کڵێسا و دەڵێت :
ئافرەتان بۆیان نیە لەکڵێسا قسەبکەن ئەگەر ویستیان شتێک فێربن با لەماڵەوە پیاوەکانیان فێریان بکات (cornithanithians 14 34 35)
وە لەکتێبی پیرۆزدا مەسیحیەکان دەڵێن :
ئافرەت لەسوڕی مانگانە چواردەوری خۆی پیس ئەکات و هۆکاری کاولکاریە (سفرلاوین 15 19 23) لە ساڵی 2013 ئافرەتانی هیند ساڵانە 50 ئافرەتیان لێ دەمرد چونکە لەکاتی سوڕی مانگانە لەگەڵ ئاژەڵاندا دەیان بەستانەوە و دەیانووت ئافرەت گڵاوە لەکاتی سوڕی مانگانە ، بەهۆکاری بێ نانی و پلەی گەرمی نزم ساڵانە بەنزیکراوی 50 ئافرەت دەمردن

وە لای هیندۆس و مەسیح و جولەکەش لەسەر هەمان ڕان کە ئافرەت لەسووڕی مانگانەدا گڵاوە
هەر شتێکیش بەری بکەوێت گڵاو دەبێت.
وە لەیەکێک لەکتێبە ئاینیەکان وتراوە:
هەر ئافرەتێ هەڵەیەک بکات ئەو هەڵەیە هەمووانی پێ لەناو دەچن .
زینا لە زۆرینەی ئاینەکان حەرامە بەڵام دینەکان هەر یەکەو پێناسەی جیاوازیان هەیە
لەئیسلامدا زیناکردن حەرامە و هەردوو ڕەگەزەکە سزا دەدرێن، بەڵام لە ئنجیل پیاوەکە بەزیناکار هەژمارناکرێ و هیچ سزایەکیشی نیە تەنها ئافرەتەکە یاخوود ئەو مناڵەش کە لەسکیدایە ، وە لەکتێبەکەشیاندا دەوترێت کە ئافرەت ئەبیت بەرماوەی نانی پیاوەکەی بخوات
(san 7ıa - git 62a)
وە لەدینەکانی تر ئافرەت دەبوو پارەبیا و بچێتە داوای کوڕ هەموو پارەکانی بەکوڕەکە ببخەشێ ئەمەش هۆکارێکی تر بوو بۆ ئەوەی کە هیچ پیاوێک حەزی بە منالّی کچ نەبێت.
لەکاتێکدا بەپێچەوانەوە ئیسلام مارەی بۆ ئافرەت داناوەو ئافرەتەکەش مافی ئەوەی هەیە کە بڕی مارەیەکەی دیاری بکات.

وە لەئینجلیدا ئافرەت بۆ نییە میرات وەربگرێ.
لەکاتێکدا لەئاینی ئیسلامدا ئافرەت دەتوانی میرات وەربگرێ و هیچ بەرپرسیارێتیەکی دارایشی لەسەر نیە ،لە لاپەڕەکانی تر زۆر بەجوانی ئەم بابەتە باسدەکرێت.

ئینجیل لەو کاتەی کە دەڵێت : لەدایکبوونی کچ دۆڕانێکی گەورەیە ،

لەوکاتەدا پێغەمبەری نازدار دەفەرمووێت : هەر پیاوێک 3 کچی هەبێ و ئارامیان لەسەربگرێ و ئاگای لێیان بێت ئەوا دەرگای ئاگری بەسەردا دادەخرێ.

لەوڵاتانی ڕۆژئاوا هەر ئافرەتێک کاتێک لەسەر ئافرەتبوونی خۆی ئەخوێنێتەوە لەدینی ئیسلام و بەراوردی دینەکان و ژیارەکانی تری ئەکات
بەرێژەی سەدا حەفتایان ئەبنە ئیسلام.
چوونکە بەهەموو پێوەرێکی ئەقڵی و دینی بۆیان دەرەکەوێت ئەوە ئیسلامە بەهای بە ئافرەت بەخشیووە.

# بەهای ئافرەت لای زانا و بیرمەندەکانی جیهان

ناپلیۆن : ئافرەت ئامێرێکە بۆ بەرهەمهێنانی منداڵ
چارلی چاپڵن: ژن و سەگ و منداڵ باشترین ئەکتەرن
شکسپیر : ئەی بێهێز کە ناوت ئافرەتە
ڕۆسۆ : ئافرەت پرچی درێژەو ئەقڵی کورتە
ڤۆڵتێر : ئافرەت هەڵەیەکی سروشتە
نیتچە : ئەگەر چویتە لای ژن دەبێت قامچیت پێبێت
دانتی : ئافرەت و خەیاڵ وەک یەکن هەردوکیان پوچن

بەڵام پێغەمبەری نازدار چی فەرمووە دەربارەی ئافرەت؟

- دونییا خێر و خۆشییە ، گەورەترین چێژی دونییا ئافرەتێکی باشە .
- تەنانەت بەگوڵیش لە ئافرەت مەدەن
- لەکاتی ماڵئاوای کردنیدا وتی : ئافرەتان ئامەنەتی خودای گەورەن ئاگاداربن
- هەرکەسێک سێ کچ بەرێزەوە پەروەردەبکات من کەفیلی بەهەشتی بۆ دەکەم
- نەرمونیان بن لەگەڵ شوشەکان
- باشترینتان ئەوەیە کە باشترینە بۆ خێزانەکەی

# کۆمەڵگا نا ئیسلامییەکان و بەهای ئافرەت

لێرەدا بەگشتی تیشک دەخەینە سەر کۆمەڵگا نا ئیسلامیەکانی جیهان بۆ ئەوەی بزانین چ بەهایەکیان بەئافرەت بەخشیووە.
سەیری کۆمەڵگا نا ئیسلامیەکان بکەن کە چۆن توشی دڕندەی و تاوان و ڕەفتاری خوڕەوشتی ناشرینن بەرامبەر ئافرەت، ببینن چەندە بەهای ئافرەتیان شکاندووە و تەنها وەک کارەکتەرێکی سێکسی لەئافرەت دەڕوانن سەیری وڵاتان بکەن بەرەو کوێ دەڕوات بزانن توشی چ کارێکی ئەخلاقی و "شذوذی جنسی" بوون!

## شارستانیەتی نوێی ئەمریکا و بەهای ئافرەت

سەیری ئەمریکا بکەن، ڕێژەی نیشتیمانی وەزارەتی دادی ئەمریکی باسی کردووە دەڵێ ئەو خەڵکانەی لە ژێر تەمەنی ١٨ ساڵیدان ٢٥% خەریکی زینان، لەشارەکان ٨٠% ، لە لادێکان ٣٣% ، هەموو مانگێك جارێك ٣٥٠،٠٠٠ ئافرەت توشی سک پڕبوون دەبن منداڵەکەیان فڕێ ئەدەن لەحاڵەتی زیناکردن، بەهەمان شێوە ٢٣% وڵاتی ئەمریکا نازانێ باوك و دایکی کێ یە لە شارەکان ٣٤%، وەزارەتی دادی ئەمریکی لە یۆلیۆی ساڵی ١٩٩٤ ڕاپۆرتێکی ترسناکی بڵاوکردوە دەڵێت: ڕێژەی دەست درێژی کردنە سەر لەشاریکی وەکو نیۆرك ٣٨٠٠جار دەستدرێژی کراوەتە سەر ئەو ئافرەتانەی تەمەنیان لە ژێر ١٢ ساڵبووە، لە ساڵی ٢٠٠٩ هەر لەشاری نیۆرکدا ڕێژەکە گەیشتە ٧٢٠٠،

ئایا وڵاتێکی وەک و ئەمریکا بەهای بەئافرەت بەخشیووە یان بەکاڵایانی کردووە؟
٢٠% ی ئەو کچانەی دەستدرێژی کراوەتە سەریان لە ڕێگەی باوکیانەوە ئەو کارە ئەنجامدراوە!،
٢٦% لەلایەن خزمەکانیانەوە دەست درێژییان لێکراوە، ٥١% بەهۆی هاوڕێ و هاوڕێکانیانەوە بەهۆی تێکەڵاوبونیانەوە، ٤% لەرێگەی خەڵکی نادیارەوە.
ئەگەر سەیری کلتوری ئەمریکا بکەین ٨٥% منالّی ئەمریکا کەلە دایك دەبێ نازانێ دایك و باوکی کێیە، ٤٠% خەڵکەکەی خەریکی خۆکوژییە، لەساڵی ٢٠٠٨دا زیاد ٣٢،٠٠٠ کەس خۆیان کوشتوە، چ شەڕێك ئەوەندە ڕێژەی کوشتاری تێدابوە؟..
سەیری وڵاتانی ئەوروپا بکەن ڕێژەی منالّی ناشەرعی
لە سوید ٥٠% ، لەبەریتانیا ٣٣%، فرنسا ٣٣%، لەساڵی ١٩٩٧ گەورەترین ئاهەنگی گێڕا سەرۆکی فەرەنسی "جاك شیراك" بەبۆنەی منالّیکی
نا شەرعی کچەکەی کەنازانێ باوکەکەی کێیە!..
سەیری ئنگلیز بکەین ٦٥% ئەو گەنجانەی تەمەنیان ١٦-١٩ ساڵ دەبی " ئەزموونی سێکس" دەکەن بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ سنورێك کە لەنێوانیاندا هەبێت، ٥٥% گەنجەکان ١٦-١٩ ساڵن ئالوودەن بە مەی و مشروب و ماددەی بیهۆشبەرەکان
لە بەریتانیا هەر لە ١٧٠ ئافرەت کەلە ژێر ١٧ ساڵیدان هەموو هەفتەیەك لاشەیان دەفرۆشرێت وەك "سۆزانی" بەپێی یاسایەکی فەرمی بۆیان ڕێکخراوە.

## لە ئەڵمانیای بووکی ئەوروپا

لە ساڵی 2010 ئەڵمانیا زۆرترین ڕێژەی مناڵبوونی نا شەرعی تۆمارکردووە لەمێژووی خۆیدا، دەستەی یەکێتی سەرژمێریکردن لە شاری "فیزبادن" لە ١٢/٨/٢٠١١ دەڵێن: لە هەرسێ مناڵێک لە ئەڵمانیا یەکێکیان لەدەرەوەی پەیوەندی هاوسەرگیریدا بووە، کە ژمارەیان دەگاتە ٢٢٥ هەزار مناڵ.

ئەم ڕێژەیەش لەماوەی ٢٠ ساڵی ڕابردوودا دوو ئەوەندە زیادی کردوە.

ئەی لە ساڵی2023 ڕێژەکە چەند بێت؟!

## لە بەریتانیا:

بەپێی هەواڵێکی ڕۆژنامەی "تەلەگراف" لە دەورووبەری ساڵی ٢٠١٦ زۆرینەی منالانی لەدایک بوو لەدەرەوەی پەیوەندی هاوسەرگیری دا دەبن، ئەم ڕێژەیەش بەجۆرێ زیادی کردووە کە پێشووتر لەساڵی ١٩٧٩ ڕێژەکە تەنیا ١١% بووە بەڵام ئێستا ٤٧.٥%ە.

وە چاوەڕێش دەکرێ لە دەوروبەری ٢٠١٦ نیوەی ڕێژەکە تێ بپەڕێنێ.!

ئەی لە ساڵی2023 ڕێژەکە چەند بێت؟!

## لە فەرەنسا:

ڕێژەی مناڵبوون لەدەرەوەی پەیوەندی هاوسەرگیری ٥٦% ە.

ئەی لە ساڵی 2020 ڕێژەکە چەند بێت؟!

## ئیستۆنیاو یۆنان:

لە ساڵی 2009 زۆرترین ڕێژەی مناڵبوونی غەیرە شەرعی لەم وڵاتەدا بووە کە ڕێژەکەی ٥٩% ە و یۆنانیش کەمترینە کە ٧% ە.

ئەی لە ساڵی 2023 ڕێژەکە چەند بێت؟!

## شیلی

لە وڵاتی "شیلی" ئەمریکای باشور ڕێژەکە گەیشتۆتە ٧١% ..

ئێستا لە چەند شارێکی ئەوروپی سەیارەی گەڕۆک لەناو شاردا دەسوڕێتەوە و داوا لە خەڵک دەکەن ئەوەی دەیەوێت بزانێت باوکی کێیە بابێ پشکنینی DNA ی بۆ دەکەین!!

ئایا مێژوو و کۆمەڵگا و شارستانییە جیاوازەکان بەهایان بەئافرەت بەخشیووە؟ بێگوومان نەخێر ببینە ئەو هەموو بازرگانی بەئافرەت کردنە! ببینە ئەو هەموو دەسدرێژییە! ببینە ئامارەکان دەڵێن 3 هەزار منداڵدا هەزار منداڵی زینایە ، ئایا زینا بەخشینی ماف و بەهایە بۆ ئافرەت؟ یان بەکاڵا کردنە و ئێستا دەمی دژە ئیسلامەکانیش بکەیتەوە مافی مرۆڤی وڵاتانی ئەوروپامان پێ دەفرۆشنەوە!
جا ئەگەر لە میدیایەکی ئەوروپی گوێبیستی دینی ئیسلام بیت ئەوان وەها وێنەی ئیسلامیان کێشاوە کە ئیسلام کۆنەپەرستییە ، لەبارەی ئافرەت دەڵێن : ئیسلام بەهای ئافرەتی کەمکردۆتەوە ، پێداگری ڕۆژئاواییەکان لەسەر مافی ئافرەت ، لەڕاستیا بریتیە لەشێوەیەکی پەردەپۆشکراوی چەوساندنەوەی گیانی ئافرەت،
بەهای ئافرەتیان بەشێوازێک بچوککردۆتەوە کە ئافرەتان ئامێرێکی دەستی بەقاڵە سێکسیەکانن ، لەژێردەستی ئەوانەن کە بەدوای چێژی بێ سنوور دەگەڕێن لەدواجاریشدا لەپشت شاشەیەکی ملەوەن لەژێر دروشمی کلتور و هونەر پشانی خەڵکی دەدەنەوە .

## دینەکان و کۆمەڵگاکانی تر چۆن مامەڵە لەگەڵ ئافرەت دەکەن؟

خوێنەری ئەم ئامارانە بن .

1_لەباربردنی منداڵ لەئەمریکا ساڵان 5700000
پێنج ملوێن و حەوسەد هەزار کەسە .
2_نزیکەی 1 ملوێن کۆیلەی ئافرەت لە ئەوروپا بوونی هەیە کە
بۆ مەبەستی خزمەتکاری
وسێکس بەکار دەهێنرێن
3_وەزیری بەرگری ئەمریکا لە ئامارێکدا ڕایگەیاند کە سەدا
78% ئافرەتان توشی دەسدرێژی سێکسی دەبنەوە
4_وەزارەتی فێرکردنی ئەمریکا لەئامارێکدا ڕایگەیان : 4.5 ملوێن
ئافرەت تووشی دەسدرێژی سێکسی دەبن لە خوێندنگاکاندا
5_پەیمانگای نیشتیمانی تەندروستی سەر بەوەزارەتی ئەمەریکا
لەئامارێکدا ڕایگەیاند
کە 70% پەرستاران گێچەڵی سێکسیان پێدەکرێت
6_لەتایوان 57% پەرستارە ئافرەتەکانی توشی گێچەڵی سێکسی
دەبن
7_خوێندنگەی (ئەلهاهیو) 12% ئافرەتانی ئەو خوێندگەیە
دەسدرێژی کراوەتە سەریان
8_لەئەمەریکا زیاتر لە 65 ملوێن ئافرەت تووشی نەخۆشیە
سێکسیەکان بوون

تێبینی : لەکۆتای کتێبەکەدا تەواوی سەرچاوەی ئەم ئامارەنە دانراون

9_ئاماری کۆمەڵگای وڵاتان دانیان بەوە ناوە کە خیانەتیان بەرامبەر ئافرەتان و خێزانی خۆیان کردووە بەم ژمارانە
أ-ئەمەریکا 50%
ب-بەریتانیا 44%
ج-ئیتاڵیا 38%
د-فەرەنسا 36%
9_لەمەریکا ئەو پیاوانەی کە هاوسەرگیریان کردووە هێشتا پەیوەندیان هەیە لەگەڵ سەرووی 15 ئافرەتی تر بەرێژەی 29%
10_لەئەمەریکا کچانی تازە پێگەشتووە بەرزترین رێژەی دەسدرێژی و سکپڕبوونیان هەیە بەرێگەی ناشەرعی کە ژمارەیان بۆهەر ساڵک سەرووی 800000 هەزار خانمن کە
11_لەبەریتانیا 90% خانمانی فەرمانبەر دەسدرێژی سێکسیان دەکرێتە سەر ، زۆرینەیان بەهۆکاری ئەوەی موچەیان بۆ زیادبکرێت ئەم ئامارانە تەنها کەمێکن ، وە تەنها ئەو حاڵەتانەن کە سەلمێندراون ئاخۆ چەند ملوێن خانمی تر بەکاڵاکراون لەبەر دەستی بەقاڵەسێکسیەکاندا ، کاتێک ئێمە دەڵێن دەبێت ئیسلام پەیرەو بکرێت ،
چونکە دینێکی جوانە دینێکی پاکە بەرامبەر مرۆڤایەتی سۆزو عەتفان بۆ زیاد ئەکا بەرامبەر ئیسلام

ئیسلام : هەڵکردنی بەیداخ و ئاڵای پاکێتی و ئەخلاق و شکۆیە..

ئیعلانکردنی بەرائەت لە پیسی و بەدڕەوشتی و بوون بە کۆیلەی ئارەزووەکانی جیهانی سەرمایەداری و لیبرالی و ڕادیکاڵی و فێمێنیزمی و فرۆشیارانی لەشی ئافرەت بە نرخێکی کەم=بثمن بخس....
بەڵکوو خۆتان ببینن چ بەکاڵاکردنێکی ئافرەتە لەوێ!

# پێوەری فێمیزنیزمی و پێوەری ئاینی ئیسلام

زۆرجار لەبیرمان دەچێت پەروەردگار ڕێزی لە ئافرەت ناوە و بە
پێوەری خوایەتی خۆی بەهای بۆ ئافرەت دیاری کردووە .
کاتێک فێمینیستەکانی ڕۆژئاوا ئاینی ئیسلامیان سڕیەوە، هیچ
شتێکیان نەما وەکوو بەهای ئافرەت ، چونکە پێوەری ئافرەتان لای
فێمینیزم و ڕێکخراوەکانی ئافرەت لای ئەوان مافی ئافرەت بریتیە
لەوەی کە ئافرەتیش ڕێک وەک و پیاوبێت لەتوانا و هەڵسووکەوت

و ژیانی ڕۆژانەیدا ، بۆیە خۆیان بە پیاو بەراورد کرد! ، لە ئەنجامدا
فێمینیستەکانی ڕۆژئاوا ناچار بوون بەهای خۆیان دیاری بکەن بە
بەراوردکردنی ئافرەتان بە پیاوان. بەم شێوەیەش گریمانەیەکی
هەڵەیان هەڵبژارد، پەسەندیان کرد کە پیاوان پێوەر بن بۆیان، لای
فێمینیستەکان ئافرەتان هەرگیز نابن بە مرۆڤیکی تەواو و کامڵ
تا ئەو کاتەی هاوشێوەی پیاوانیان لێ نەیەت
کاتێک کە پیاو قژی دەبڕی، ئەوانیش قژیان دەبڕی. کاتێک پیاوان
دەچوونە ڕیزی سوپاوە،
ئەوانیش دەچوونە ڕیزی سوپاوە.
ئەم شتانەیان دەویست چونکە پیاوان (تاکە پێوەری ژنانن) لای
ئەوان..
ئەو شتەی کە ژنان هەستیان پێ نەکرد، ئەوە بوو کە پەروەردگار
پیاوان و ئافرەتانی بە جیاواز دروستکردووە، نەک هاوشێوەی یەکتر.
ژنان کاتێک پیاوان وەک پێوەری خۆیان دیاری دەکەن، ئەوکاتە
تایبەتمەندییەکانی سروشتی خانم بوونیان دەبێتە خاڵی لاوازیان!!

بەڵام پێویست ناکات ئافرەتانی موسوڵمان بەم شێوەیە خۆیان کەم بکەنەوە، چونکە پەروەردگاریان وەک پێوەر هەڵبژاردووە.
پەروەردگار بەهایان بۆ دیاری دەکات، بۆیە پێویستییان بە پیاوان نییە بەهایان پێ بدەن. بە ڕای من تەنها خۆمان نزم دەکەینەوە بە هەوڵدانمان بۆ بوون بە شتێک کە نیین کە ئەویش بریتیە لەوەی ئافرەتان ڕێک وەک پیاوان بن کە ئەمە هەرگیز ناکرێ و ئەگەر بکرێت گەورەترین و ترسناکترین گۆڕانی سروشتیە لە سروشتدا !
بەڕاستی ئافرەتی مسوڵمان نایەوێت وەک پیاو بێت ، ژنانی موسوڵمان هەرگیز ناگەن بە ئازادی ڕاستەقینە، تاکو ئەم کاتەی واز دەهێنین لە لاساییکردنەوەی پیاوان، بەهای جوانیمان تەنها لەو جیاوازییەدایە کە پەروەردگار پێی بەخشیوین. لای ئافرەتی دونیای ناوەڕۆک و ئامانج گرنگ نییە چونکە ئافرەتی دونیای پێی وایە تا ئەو ڕادەیە گرنگە کە پیاوان لە خۆیان ڕازی بکەن و لای پیاوانەوە جوان دەربکەون.
ژیانیان بەسەر برد لە ڕێی جوانکاری، جەستەیان تەرخان کرد بۆ ڕێکلامەکانی فرۆشتن، لە کاتێکدا ئەوانیش بەندە بوون، بەقاڵە سێکسیەکانیش پێیان دەگووت کە ئازاد و سەربەستن. سوێندیان خوارد کە سەرکەوتوون ، فێریان کردن کە مەبەستی ژیان بریتییە لە خۆدەرخستن و سەرنجڕاکێشان و جوانبوون بەلای پیاوانەوە.
باوەڕیان پێیان هێنا کە جەستەیان دروست کراوە بۆ بازاڕکردن و فرۆشتنی ئۆتۆمۆبێلەکانیان، بەڵام درۆیان کرد. جەستە و ڕوحمان لەپێناو شتێکی باڵاتردا دروستبووە،
شتێکی زۆر باڵاتر.
(يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) ١٣/الحجرات.
ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە دروستمان کردوون لە نێر و مێیەك وە کردوومانن بە چەند گەل و هۆزەوە تا یەکتری بناسن، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا پارێزگارترینتانە، بێگومان خوا زانای ئاگادارە.

## مافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا

شۆڕشی ڕادیکاڵی ئیسلامی مافی ئافرەتی داوە و دەریخستوە لە ڕۆژانی نەزانی ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر.
ئامانجی ئیسلام بریتی بووە لە نوێکردنەوەی بیرکردنەوەمان ، ژیانمان ، بینینمان ، بیستنمان ،هەستمان .
هەروەها خەبات کردن بۆ بەرزکردنەوەی بەهای ئافرەت و ئازادکردنی ئافرەت لە کۆمەڵگادا و بەردەوامیش دەبێت ، پێش ئەوەی زیاتر لە بابەتەکە بدوێم ئەمەوێت سەرنجتات بۆ بابەتێک ڕابکێشم ،
نزیکەی 20% دانیشتوانی جیهان لە مسوڵمان پێک هاتوون ، بەڵام مەرج نییە هەر کەسێک مسوڵمان بوو سیفەتی خودای و سیفەتی ئاینی ئیسلامی هەڵگرتبێت ، بۆیە هیچ کات لەسەر پێوەری خەڵکی مسووڵمان بڕیار لەسەر دینی ئیسلام مەدە ، بەڵکوو بگەڕێوە بۆخوودی ئاینەکە، سەرچاوە ڕاستەقینەکانی ئیسلامیش بریتین لە قورئان و بەتەفسیری باوەڕ پێکراوەوە لێیان تێبگە خوێنەری ئازیز ..

قورئان کە وتەی خودایە هەروەها سوننەتە و خووڕەوشتی پێغەمبەری خۆشەویستمان سەلامی خوای لێبێ
هەرگیز قورئان ناکۆکی تێدانیە نە فەرمودەی سەحیحیش ئەو دوو سەرچاوەیە هیچ دژایەتیەکیان تێدانیە ،

ئاینی ئیسلام ، مەنهەجێکە بۆ جیهانبینیەکی ڕاست و ناسینی کەڵک و بەهای هەموو مەخلوقەکان لەلایەن خالقەوە ، هاتنی ئاینی ئیسلام لەمێژوودا و لەئێستا و لەداهاتووشدا ئاینێک بووە کە کلیلی هەموو قوفڵێکی تووندووتیژی و ماف و بەها بووە وەک خۆی ، لێرەدا ئێمە باسی هەندێک لەو مافانە دەکەین کە واجبی هەموو پیاوێکە ڕەچاوی ئافرەتی بکا و ، لەگەڵ هاتنی ئاینی ئیسلام چیتر ئافرەت بوکەڵەیەکی سێکسی نیە و لەگەڵ لەدایک بوونیدا زیندەبەچاڵ ناکرێ و بەکۆیلە بوونی ئافرەتیش بوونی نامێنێ ، هەندێک لەو مافانەی کە ئیسلام بەئافرەتی داون ، بۆنموونە وەک (مافی پەروەردەی

* مافی کۆمەڵایەتی * مافی ئابووری * مافە گیانیەکان * دابەشکردنێکی دادپەروەری لەنێوان ئەرکەکانی پیاوان و ئافرەت

* ئاسایشی دارای * مافی مارەیی * ئافرەت باری دارای لە ئەستۆ

نیە * مافی میرات * مافە کۆمەڵایەتیەکانی هاوسەر * مافە

کۆمەڵایەتیەکان بۆ دایک و خوشک و کچ * مافە سیاسیەکانی

ئافرەت * مافە یاساییەکانی ئافرەت ) ئەم مافانە مشتێکن لە خەرمانێک! ببینە ئاینی ئیسلام چ دیوێکی قوڵی دادپەروەریە ، بەڵام کێشەی بەشێکی بێدینان لەگەڵ ئاینی ئیسلام ئەوەیە لەسەر خەڵکی مسوڵمان بڕیار ئەدەن لەسەر ئاینی ئیسلام ، لەکاتێکدا ئەمە دادپەروەری نیە بەڵکوو بۆ هەر باسێک و مافێک لەئاینی ئیسلامدا دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ سەرچاوە ڕاستەقینەکان کە قورئان و فەرمودەیە و ئەو دوانەش دەبێت بە تەفسیری باوەڕ پێکراوەوە بیخوێنیتەوە ، تاکوو ئیسلام بناسیت بە بێ زیاد و کەم ، ئەو مافانەی کە لەسەرەوە باسمان کرد بە پشتیوانی الله هەوڵ دەدەین باسیان بکەین ،

# مافی پەروەردەی ئافرەت لەئاینی ئیسلامدا

لەمێژوودا و لە 90% ئاین و ژیارەکانی تر
ئافرەت مافی پەروەردەی و تەنانەت کۆمەڵایەتیشی پێنەدراوە ،
یاخوود بەشێوازێکی زۆر کاڵ و ئاست نزم پێیان بەخشراوە
وەک چۆن لەئینجیلی دەسکاری کراو دەڵێت : ئافرەتان بۆیان
نیە لە کڵێسا قسە بکەن گەر پرسیاریان هەبوو با لەماڵەوە لە
پیاوەکانیانی بکەن! ، بەڵام لەگەڵ ئاینی ئیسلام مامەڵەی خراپ
کۆتای پێدێت و ئافرەتان و پیاوان مافی پەروەردەییان نەک
پێدراوە ئەسڵەن بەسەریشیانەوە واجبە!
وەک لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت : اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ
(١) . مێژووی ئاینی ئیسلام پڕ پڕن لە ئافرەتانی زانا کە بەدەیان
زانای گەورەیان پێگەیاندووە و پڕبوونە لە زانستی جۆراوجۆر
و دوای وەفاتیان بیر و زانست و شاکار گەلی زۆر مەزنیان
بەجێهێشتووە دوای خۆیان ، کە ئەمەش دەیسەلمێنێت ئافرەت
لەئاینی ئیسلامدا ڕێزلێگیراوترین بووە و هیچ کات لەبەهای
بچووک نەکراوەو بگرە فەرزیش کراوە بەسەریدا کە فێری
زانست و زانین و زانیاری بێت ،
یەکەمین ئایەت کە لەقورئاندا دابەزی لە سورەتی (العلق)
ئایەتی ژمارە 1-5 کە دەفەرموێ بخوێنە!
واتا یەکەم ئایەت نەیفەرموو بەڕۆژووبن و نوێژبکەن و
ببەخشن ، بەڵکو هانی زانست و زانیاریمان دەدات و فەرزی
دەکات بەسەرماندا ،
لە صحیح بوخاریدا دەڵێت : ئافرەتان لەسەردەمی پێغەمبەردا
زۆر بەگڕ و تین بوو بۆ خوێندن وە پێغەمبەر پەیمانی پێدان
کە کاتیان بۆ تەرخان بکات و نوێنەرێکی بۆ ناردن بەپەیامەوە
بۆ ڕوناکبیری و فێرکردنیان ،

سەرەکی ترین نموونەش بریتیە لە عائیشەی کچی ابووبکر کە خێزانی پێغەمبەرە و کە ڕێنمایی گەلێکی گەورە بە کۆمەڵگای ئیسلامی بەخشیووە ، چەندەها هاوەڵ شایەتی دەدەن کە هیچ زانایەک بەهێندەی ئەو زانیاری لەبارەی قورئانەوە نەبەخشیووە ، لە ئەرکە پێویستیەکان ، کێشەی یاسای و نایاساییەکان ، سامان ، ئەدەب ، مێژووی عەرەب ، بۆماوەزانی ، خاوەنی زانیاری کاریگەری پزیشک بووە هەر کاتێک نوێنەرە بیانییەکان هاتبان بۆلای پێغەمبەر چەندەها چارەسەری نەخۆشیان لەگەڵ خاتوونە عائیشە تاوتوێ دەکرد ، پسپۆڕ بوو لەبواری بیرکاریدا و هاوەڵە بەناوبانگەکان زۆرینەی کات پشتیان پێدەبەست لەبواری کێشە و گرفتەکانی میرات و پشک و دابەشکاری ، چەندەها هاوەڵی کاریگەر و بەناوبانگ بەدوای ئامۆژگاریەکانی وێڵبوون وەک خلیفەعمر ، عبدالله بن عمر و ابووهریرە ، وە 2210 فەرمودەی گێڕاوەتەوە ، وە ابووموسای اشعەری کە خۆی زانا و یاسازان بوو دەڵێت هەرکاتێک لە فەرموودەیەکدا کێشەیەکمان بۆ دروست بوبا پشتمان بەم خاتوونە بەڕێزە دەبەست و هەمیشە فریاد ڕەسی کێشەکانمان بوو لەبواری زانین ، وە لەمێژووی ئاینی ئیسلامدا 88 زانای زۆر گەورە لەخاتوو عائیشەو فێربوون ، یاخوود صەفیەی خێزانی پێغەمبەر کە شارەزا لەبواری فیقدابوو ، ئیمامی نەوەوی لەسەری دەڵێت شارەزاترین ئافرەتبووە لەبواری خۆیدا ، وە ناوی 32 زانا هەیە کە لەئەوەوە فێربوون ،

یاخوود فاتیمەی کچی قەیس کە ئەویش شاکارێک بوو لە زانین و زانستدا لەسەردەمی خۆی کە شارەزاییەکی قوڵی هەبوو لەکار و باری دادگای ، وە لەمێژووی ئیسلامدا بە هەزارەها ئافرەتی دی زانا و ڕوناکبیر و شاکارگەلێکی دوای خۆی جێهێشتووە ، وەک سیدە نفسیە و فاتیمەی کچی قەیس و عائیشەی کچی سعد کە ئەمانە هەموویان زانا بوون و دەیان زانای گەورەیان پێگەیاندووە لەبوارە جیاوازەکان ئەم خاتوونانەی کە باسکران دڵۆپێک ئاون لە زەریای خانمانی لێهاتوو و زانا لەئاینی ئیسلامدا ، کە ئەوەش ئەوە دەسلمێنێت ئاینی ئیسلام ڕێگری لە پەروەردە و فێربوونی خانمان نەکردووە و بگرە فەرزیشی کردوون بەسەریدا لە 1400 ساڵ پێش ئێستا کەچی ئێستا لەوڵاتە نائیسلامیەکان ئافرەت بەکۆیلەی ئەکرێ و تازە بچووک ئەکرێتەوە لە بازنەی سێکسیدا لەژێر دەستی بەقاڵە سێکسیەکاندا

# مافی ئابووری ئافرەت لەئاینی ئیسلامدا

ئاینی ئیسلام گەورەترین ڕۆڵی هەبووە لەوەی کە ئافرەت خاوەنی مافی ئابووری خۆیبێ ، چونکە پێش هاتنی ئاینی ئیسلام لەزۆرینەی کۆمەڵگا و ئاینەکانی تر دەبوو ئافرەت تەواوی ئەو پارەنەی کە کۆی کردۆتەوە لەگەڵ پارەی خێزانەکەشی بیدا بەو کوڕەی کە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەکات ، دوای هاوسەرگیریەکەش ئافرەت هەرچیەکی دەست بکەوتبا دەبوو بیدا بەپیاوەکەی . ئاینی ئیسلام وێڕای ئەوەی کە مافی ئابووری بەئافرەت داوە تەنانەت مافی میراتی و منفی مارەییشی پێ بەخشیووەبەڵام لە ئاینی ئیسلامدا خودا لە قورئانی پیرۆز ئەفەرموێت

(لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا) النساء(7).

بەم پێیە ئافرەت توانی میراتی باوک و مێردی و برای و کوڕەکەی بگرێت ، جا زۆرجار دژە ئیسلامییەکان دەڵێن بۆچی لە میراتدا ئافرەت کەمتری بەرەکەوێت ئەمە نا یەکسانییە ، بەڵێ ئێمەی مسووڵمانیش دەڵێین ئەمە نا یەکسانییە بەڵام ئەمە ئەوپەڕی دادپەروەرییە بۆچی؟ چونکە ئافرەت لەئاینی ئیسلامدا باری داری لەئەستۆ نییە بەڵکو باری داری خۆی لە ئەستۆی خێزانە بۆنموونە ، باوک دەبێت باری دارای کچەکەی لە ئەستۆ بگرێت ، پیاو دەبێت باری دارای خێزانەکەی لە ئەستۆبگرێت ، برا دەبێت باری دارای خوشکەکەی لەئەستۆبگرێ ئەگەر باوکی نەما ، ببینن!! ئافرەت باری دارایشی لەئەستۆ ئەگیرێ و هێشتان مافی دارای دەرەکیشی پێدراوە!! وە لەبابەتی مافی میرات بە 14 حاڵەت لەئاینی ئیسلامدا باسکراوە کە تێیدا لە 10 حاڵەتدا ئافرەت زیاتری بەردەکەوێت لەمیراتدا .

# مافی مارەیی ئافرەت لە ئاینی ئیسلامدا

لەو کاتەی لە سەردەمی پێش ئیسلام ئافرەت
 وەک باسمان کرد دەبوو ئافرەت پارە و موڵکی خۆی بەپیاو
بدات ، بەڵام لەگەڵ هاتنی ئاینی ئیسلام مارەیی مافی ئافرەتە
و کەسی تر مافی نیە دەست کاری بکات و دەستی لێ بدا ،
وە بابەتی مارەیی لەئاینی ئیسلامدا سنووری بۆ دیاری نەکراوە
لەلایەن خودا و ئاینی ئیسلامەوە بەڵکو بەپێی ئاستی توانای
دارای و ژینگە بڕیاری لەسەر دەدرێت ، وە لەسەر پیاو واجب
کراوە کە ئەو مافە بدات بە ئافرەت هیچ بیانوویەک نیە بۆ
نەدانی مەگەر ئیلا ئافرەتەکە لەقوڵای دڵیەوە خۆی بڕیار بدات
کە گەردنی پیاوەکەی ئازا بکات ، وەک باسمان کرد جگە لەو
خاڵە هیچ بیانوویەک نیە بۆ نەدانی مارەی و ئەو مافە خوودا بە
ئافرەتی داوەو هەرکەسێک خۆی بەهەڵگری ئاینی ئیسلام بزانێت
مسووڵمان نییە تا ئەرکە خواییەکان جێ بەجێ نەکات ، ئیسلام
بە 1400 ساڵ بەر لە ڕۆژئاوا مافە ئابوریەکانی داوە بە ئافرەتی
مسوڵمان دەتوانێت ببێت بە خاوەنی پارە دەتوانێت سامانەکەی
بەکار بهێنێت یان بەکاری نەهێنێت بەبێ ئەوەی پرس بە
کەس بکات لەپەڕەیەکی. نوێی ئینگلتەڕا کە لەساڵی ١٨٧٠
درکی بە مافە ئاوبوریەکانی ئافرەتیان دەرکرد درکیان بەوەکرد
کە ئافرەت دەتوانێ ببێ بەخاوەنی سەروەتی خۆی..

# مافە کۆمەڵایەتیەکانی دایک لە ئاینی ئیسلامدا

پێگەی ئافرەت لە خێزاندا دابەش دەبێت
بەسەر چوار پایەدا
(( دایک - هاوسەر - کچ - خوشک ))
با بزانین خوودا لەڕێگەی ئاینی ئیسلام دەربارەی ئەم چوار پایەیە چیمان پێدەڵێت .
1_مافە کۆمەڵایەتیەکانی دایک لەئیسلامدا

لەوڵاتە پێشکەوتووەکان و کۆمەڵگا گەورەکان و زۆرینەی ئاینەکان دایک زۆر بچووک کراوەتەوە یاخوود ئەسڵەن بوونی نەماوە و وەک خۆی مافی پێ نەدراوە ، چونکە بەتایبەت لەوڵاتە بەناو پێشکەوتووەکان ئەسڵەن دایک بوونی نییە ، چونکە لەوێ بابەتی منداڵ بوون بریتی نیە لەوەی کە دایکێک قووربانی بدا و منداڵێک پەروەردە بکات کە نەبێتە کەلێنی سبەینێی کۆمەڵگا ، بەڵکوو لەوێ دایک بوون تەنها دەرئەنجام و چێژێکی سێکسی ناشەرعیە! لەو وڵاتانەی ئیسلام ئاینیان نییە منداڵ تەنانەت نازانێ دایکی کێیە؟ دایک چیە ؟ ئەرکی چیە ؟ مافی چیە ؟ ، لەکاتێکدا دایک بوونێکی زۆر گەورەیە ئەرکەکەشی پیرۆزترین ئەرکی مرۆڤایەتیە لەبەرامبەر ئەرک و بوونەکەشیا پێویستە گەورەترین ڕێز و مافی لێ بگیرێ ،
لێرەدا زانیمان ئاین و ژیارەکانی تر ئەم ئەرک و ماف و بوونەیان پشت گوێ خستووە
بەڵام بابزانین ئەرک و ماف و بوونی دایک لە ڕوانگەی ئاینی ئیسلام و شەرعدا چۆن خوێندنەوەی بۆ کراوە ، لەئاینی ئیسلامدا
( لە ئاینی ئیسلامدا لەدوای خوا پەرستی گەورەترین ئەجر و پاداشت لە ڕێزگرتنی دایکدایە!! ) سەرچاوە لەسوڕەتی الاسراء ئایەتی 17 ..

بوونی دایک بەڕادەیەک گەورە و پیرۆزە کە پێغەمبەرمان دەفەرموێت باشترین کەس هەوڵی باشترینی بۆبدرێت 1- دایکە 2-دایکە 3-دایکە 4-باوکە ، دەقی فەرمودەکە بەم شێوازەیە
(((عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: جاء رجل إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال: يا رسول الله، مَنْ أحقُّ الناس بِحُسن صَحَابَتِي؟ قال: «أمك» قال: ثم مَنْ ؟ قال: «أمك»، قال: ثم مَنْ؟ قال: «أمك»، قال: ثم مَنْ؟ قال: «أبوك». متفق عليه. وفي رواية: يا رسول الله، مَنْ أحقُّ بحُسْنِ الصُّحْبَةِ؟ قال: «أمك، ثم أمك، ثم أمك، ثم أباك، ثم أدْنَاك أدْنَاك))) سەرچاوە [صحيح] - [الرواية الأولى: متفق عليها. الرواية الثانية: رواها مسلم]المزيـد ... )
یاخوود لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری نازدارمان لەکاتێکدا گەنجێک ئەیەوێت لەگەڵی بێت بۆ جیهاد (جەنگ) پێغەمبەر بە گەنجەکە دەفەرمووێت دایکت ماوە؟ گەنجەکە دەڵێت بەڵێ ، پێغەمبەریش دەڵێت بڕۆرەوە لای پێیەکانی دایکت بەهەشت لەوێیە!
دەقی فەرمودەکەش بەم شێوەیەیە :
(( النبي صلى الله عليه وسلم فقال: يا رسول الله أردت أن أغزو، وجئت أستشيرك؟ فقال: هل لك من أم؟ قال نعم: قال: «فالزمها؛ فإن الجنة تحت رجليها».قال المناوي: «والمعنى أن التواضع للأمهات وإطاعتهن في خدمتهن وعدم مخالفتهن إلا فيما حظره الشرع سبب لدخول الجنة))
هەروەها قورئان کە وتە خودایە ، خوودا لەڕێزی دایک لە قورئاندا واجبی دەکات بەسەرمانەوە کە ڕێز لە دایکمان بگرین ، هەروەها باسی لە ئازار و ماندووبوونی دایک کردووە کە بە پێستی سکی کۆرپەلەیەک بەو پەڕی بێهێزی و بەرپرسیاریەتیەوە هەڵدەگرێت ، دەقی ئایەتەکە دەفەرموێت : (((وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ)))  ( 14 ) لوقمان

هەرکەسێک هەڵگری ئاینی ئیسلام بێت ، دەبێت شوێنی قسەی خوودا و پێغەمبەری نازدار بکەون ، بەچاوی خۆشتان ببینن ئەمانە بەشێکی کەمن لە فەرموودە و ئایەت دەربارەی قسەکانی خوودا و پێغەمبەر ببینن ئەم ئاینە پڕ بەپێستی خۆی بەها و ماف و ڕێزی بەخشیووە ، لێرەدا ئەی ئەو کەسانەی کە دژایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن بۆ ئەم کتێبە وڵامم ئەوێت!.

# مافە کۆمەڵایەتیەکانی کچ لە ئاینی ئیسلامدا

پێش هاتنی ئیسلام لەزۆرینەی کۆمەڵگاکان کچ وەک شکست و هەڵەی سروشت ناوی براوە !
لەزۆرینەی گۆمەڵگاکان کچ زیندە بەچاڵ کراوە
لە هندستان ئافرەتان لەکاتی سورِی مانگانە لەگەڵ ئاژەڵدا دەبەسترانەوە
لە ئینجیلی دەستکاری کراو ئافرەت دەبێت بێدەنگبێ و هیچ قسەیەک نەکات لەکڵێسادا
لە چین پیاوان بە بیانووی جیاواز جیاواز دەیانتوانی ئافرەتان بکوژن بێ هیچ سزایەکی یاسای
لای زۆرینەی بیرمەندانی جیهان ئافرەت ئامێرێکە بۆ دروست کردنی منداڵ و چێژی سێکسی و هەڵەی سروشت
لە جولەکەدا لەکاتی زینا تەنها ئافرەت سزادەدەرێ
لە مێژوودا ئافرەتان خاوەنی هیچ مافێک و بەهایەک نەبوون تەنانەت ڕوحەکەشی بە ڕوحێکی نزم و سووک لەقەڵەمدراوە لەدوای پەیماننامەی فەرەنسا لە ساڵی 584 ...
لەکۆمەڵگا نا ئیسلامیەکان ئێستا کە ڕێکلامی پێشکەوتن ئەکەن کەچی ئافرەت بەکاڵا دەکرێ بۆ ڕیکلامی سەیارە و بەناوی مافی جۆراوجۆر و ڕووتکردنیان بۆیان کردووەتە پێشکەوتن و بەکاڵای سێکسی کراون و ئێستاش 1 ملوێن ئافرەتی کۆیلە لە ئەوروپا بوونیان هەیە
بەڵام !!! لەئیسلامدا
ئافرەت ، بوونی وەک حیکمەتی خودا لەقورئان باسکراوە ، لای پێغەمبەری ئازیز وەک نیعمەت باسکراوە ،

سەرەڕای ئەم جیهانە قوڵەی ڕێز لە ئیسلامدا ، لەفەرموودەیەکدا پێغەمبەرمان دەڵێت هەرکەسێک دوو کچ یان دوو خووشک بەڕێز و خۆشەویستی بەخێوبکات تا ئەیدەتە دەستی پیاوێکی مەرد و بەحەلاڵی ژیانی هاوسەرگیری ئەنجام دەدەن لەگەڵ مندا دێنە بەهەشتەوە!! ، دەقی فەرموودەکەش بەم شێوەیەیە ((لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي يَعُولُ ثَلاَثَ بَنَاتٍ، أَوْ ثَلاَثَ أَخَوَاتٍ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ، إِلاَّ كُنَّ لَهُ سِتْـرَاً مِنَ النَّار))

کچان گوڵی نێو ماڵن، بەرەکەتی خێزانن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆر منداڵی خۆشویستوون و ڕێزی گرتوون، بە تایبەت کچەکانی بێ جیاوازی، وە بە شێوەی کرداری پیشانی عەرەبی داوە، ئەو تێگەیشتنەیان هەڵەیە کە خراپ مامەڵە کردن و بە سووک سەیرکردنی ئافرەتە، جا پێغەمبەری خوا

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:

ڕقتان لە کچان نەبێتەوە (خۆشتان بوێن)، چونکە کچەکان دڵخۆشکەری (خێزان و خانەوادەن) و ڕێزدار و بەهادارن.

بڕوانە (أخرجه:أحمد ١٧٣٧٣..والطبراني في الكبير ٨٥٦ ) کچ مارە ناکرێ تا مۆڵەتی لێ وەردەگیرێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مۆڵەت لێوەرگرتنی چۆنە؟ فەرمووی: بێدەنگ بوونیەتی، (چونکە

جاری وایە کچ شەرم دەکات بڵێ: دەمەوێ شوو بە فڵان کەس بکەم)

بڕوانە (أخرجه:البخاري:٤٨٤٣ ومسلم ١٤١٩ أبی هورەیرە)

تێبینی // تەواوی ئەم قسانەو خودی فەرموووەکەش بۆ کچ و بۆ خوشک کاری پێ دەکرێ..

# مافە کۆمەڵایەتیەکانی هاوسەر لەئاینی ئیسلامدا

هۆکاری داڕووخانی خێزانی و خیانەت لە وڵاتە پێشکەوتووەکان ئەو
کۆمەڵگایانەی کە هەڵگری ئاینی ئیسلام نین
بەشێکی زۆر گەورەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە
کە زۆر بەئاسانی دەستیان لەکچ گیرئەبێ و دواتریش هیچ
پێوەرێکی ئاینی و فکریان نیە بۆ ئەوەی ڕێز لە ژنەکانیان بگرن ،
لەڕووی فکریەوە
باو باپیریان واهاتووە خیانەت لەدایکیان بکەن
لەڕووی بیرکردنەوەی ئاینیشەوە ئەوان ئەسڵەن ئاینیان نییە تا
ئاینەکەیان سنوریان بۆدیاری بکا
واجبی بکات بەسەریانەوە کە ئەبێت ڕێز و ماف ببەخشن بە خێزانی
خۆیان ،
بەڵام پێغەمبەرمان لەبارەی هاوسەرەوە دەفەرموێت
دوونیا خێر و خۆشیە ، باشترین نیعمەتیش هاوسەرێکی باشە ،

لە پەڕەی دواتردا لەژێر ناوێکی تر بابەتی هاوسەر لەڕوانگەی
شەرعەوە زۆر بەوردی باس کردووە

# گرنگی هاوسەر لە ڕوانگەی ئاینی ئیسلامدا

لە 95% ئاین و ژیارەکانی تر ئافرەت وەک سەرچاوە و هۆکاری کێشە دانراوە ، بەجۆرێک ئافرەت وەک ئامرازی تاوانکاری ناوی براوە
بەڵام ، لەقوورئاندا ئافرەت بە وشەی (م حصنە)
وەسف کراوە ، ئەم وشەی م حصنە لەزمانی عارەبی بەواتای قەڵایەک دژی خراپەکاری دێت!!!
چوونکە ئافرەتی مسووڵمان پارێزەی پیاوەکەیەتی لەخراپەکاری و ئەو ڕێگایانەی کە بەهەڵەی ئەبەن ، هەروەها لەسەر ڕێگا ڕاستەکە (سراط المستقیم) پیاوەکەی خۆی ئەهێڵێتەوە ،
هەر بۆیە بە وشەی (م حصنە) واتا قەڵایەک دژی خراپەکاری وەسفی کراوە ، لەقورئانی پیرۆزدا
باسی هاوسەر یاخوود ژن و مێرد لە سووڕەتی الروم لەئایەتی 21 دەڵێت : "ئێمە ئافرەتمان هەر لەخۆتان دروست کردووە ، بۆ ئەوەی ژیانێکی هێمن بەسەر ببەن و هەروەها خوودا ڕێز و خۆشەویستیشی خستووەتە نێوان دڵەکانتانەوە"
وە پێغەمبەری ئازیزمان لەبارەی هاوسەرگیرەوە دەڵێت : پێویستە هاوسەرگیری ئەنجام بدەن ،
هاوسەرگیری نیووەی ئیمانت تەواو دەکات .
مەبەستی پێغەمبەری نازدارمان لەوەدایە
کە هاوسەرگیری دوورت دەخاتەوە لە زینا و هاوڕەگەزبازی هتد ، تەنها لەکاتی هاوسەرگیریدا دەرفەتی بوون بە خێزان و دایک و باوک بوونت هەیە
کە هەریەکێک لەو دەستەواژانەش یەکێکن لە ئەرکە گرینگەکانی ئیسلام ،
خودای جیهانیەکان لە قورئاندا لە بابەتی هاوسەرگیری دەفەرموێت : شتێک مەهێڵنەوە بۆ ئافرەتان کە دژی خواستەکانیەتی ) سەرچاوە : سوڕەتی نساء ئایەتی 19 .. هەر لەقورئانی پیرۆزدا لە سوڕەتی بەقەڕە لەئایەتی 228 دا خودا دەفەرموێت:
ئافرەتانیش مافیان بەسەر پیاوانەوە هەیە وەک چۆن پیاو مافی بەسەر ئافرەتەوە هەیە ،

وە لە قورئاندا هاتووە کە پیاوان لەڕووی خزمەتکاریی و فیداییەوە پلەیەکیان زیاترە لە ئافرەتان ، کە ئەم ئایەتە دەفەرموێت : ( الرجال قوامون النساء ) مولحیدەکان دەڵێن واتا پیاوان پلەیەکیان لە ئافرەتان زیاتر ، وە بەڵێ بەپێی ئەو ئایەتە پیاو پلەیە لە ئافرەت بەرزترە ، بەڵام ئەو پلەیە چییە ؟ وشەی قوام لە اقم هاتووە کە وشەی اقم بەمانای ڕووبەڕووبوونەوەو ئامادە باشی دێت ، کەواتە پیاو لەخزمەتکردا لە ئافرەت زیاترە ، وە ئەم ئایەتە سوپاس بۆ خوودا لە نەتەوەی کوردا زۆر کاری پێدەکرێت ، بچووکترین نموونە برۆ بزانە لەو بازاڕەیا کەس قبوڵی ئەکا ناو خوشک و دایکی بهێنی ؟ ڕەنگە تا لێواری مەرگیشت لێبدات چونکە ئەڵێ ئەوە جوێنی شەرەفە کە خوودی ئەو شەرەفەش لەو ئایەتەی خوداوە هاتووە ، هەر لەقورئاندا خوودا دەفەرموێت لەڕووی بەرپرسیارێتیەوە خوودا بەرپرسیارێتی زیاتری بە پیاو داوە ، وە خوودا لە قورئاندا واجبی دەکات بەسەرمانەوە کە دەبێت پیاوان مامەڵەی نەرم و شیاو لەگەڵ ئافرەتاندا بکەن تەنانەت ئەگەر خۆشیشتان نەویستن!! . سەرچاوە : سورەتی نساء ئایەتی 19 ،
ئەگەر سەیری بکەن خەڵکانێک هەیە دەڵێن ژنیماڵەوە ، یان کاتێک لە ئافرەتێک ئەپرسی چ کارەی دەڵێ ئافرەتی ماڵەوەم ، بەڵام لە ئاینی ئیسلامدا ئافرەتی ماڵەوە بوونی نیە بەڵکو دامەزرێنەری ماڵ بوونی هەیە!! ببینن ئاینی ئیسلام چ دیوێکی قوڵی ڕێزگرتن و ماف و دیاریکردنی بەهای شتەکانە ئەوەش بەڵگەی خودایە کە دەیسەلمێنێت خوودا ئێمەی دروست کردووە
خوودا ئێمەی دروست کردووە و خۆشی ئەزانێ چی باش و خراپە بۆ ئێمە بۆیە باشترین پێوەر پێوەری خوداییە نەک پێوەری مرۆڤ و جێندەر و فێمینیزمی و هتد !! ..
یەکێکی تر لەجوانی قورئان ئەوە خوودا لە نێوانی ئافرەت و پیاو دەڵێت : پیاوان پۆشاکن بۆ ئافرەتانیان و ئافرەتانیش پۆشاکن بۆ پیاوانیان
ئەی تۆ ئەزانی گرنگی پۆشاک چییە ؟
گرنگی پۆشاک ئەوەیە کە ، جوانیت پێدەبەخشێ ، عەیبەکانت دادەپۆشێ و پارێزگاریکردنە لە هاوسەر ،

# جەنگی جیهانی جێندەری

ئەم جۆرە جەنگە دژی بایەلۆژی ئافرەتە ! باوەڕیان بەهیچ جۆرە جیاوازیەکی بایەلۆژی و کۆمەڵایەتی نییە ! تەنانەت ئەڵێن هێزی جەستەی پیاو بەهۆی پەروەدەی کۆمەڵایەتیەوە دروست بووە ! هەوڵی جێندەریەکان کردنی ژنە بەپیاو و فۆرمی ژن بوون لەجیهاندا بسرنەوە ! چۆن ئەوان هەموو تایبەتمەندیەکانی مێینە بوون بەناشرینی و کەمی دەزانن ئەو شتانەی خوا بە ئافرەتی بەخشیووە بە ناشرینی دەزانن ،ئەو بەناو ڕێخراوەکانی مافی ژنان لەقۆناغی جێندەرین  داوای یەکسانی ڕەگەز دەکەن ! کەواتا بزانن چەن جەنگەکە مەترسیدارە !  وشەی gender بەمانای رەگەز دێ و لەبری ( نێر و مێ ) بەکاردێت بۆیە ئەوان ئەو جێندەرە بەکاردێنن و دەڵێن مەرج نیە ژن تاسەر مێ و دایک بێت لەوانەیە ژن ببێتە باوک گەر ویستی! ،  پیاویش مەرج نیە تا  سەر نێر بێت و باوک بێت خاوەن خێزان بێت ! مەرج نیە خێزان بمێنی بۆ ژیان گەریش خێزان ماوە مەرج نیە بە زەواج بمێنیتەوە مەرجیش نیە هەر ژن و پیاو خێزان بن ! دەکرێت ژن و ژن یان پیاو و پیاو یان مرۆڤ و ئاژەڵ دەتوانن خێزان بو ،  شەرعیەتدان بە نێربازی و نەهێشتنی ڕۆڵی باوک و دایکە لە خێزان و ئازادکردنی جەستەی ئافرەتە چۆن دەیەوێ وابەکاری بێنیت ئەمەش جۆرێکی نوێی ترسناکە لە بواریشفرۆشی چەندین بەڵای زۆر ترسناکیشی بەدوایا دێت ،  ئێمە کێشەمان ئەم جۆرە فیکرانە نیە بارۆژئاوا خاوەنی بن! بەڵام بزانە ئەوە جێندەرە کە خەریکن ئەم جۆرە بیرۆکانە بڵاوەدەکەنەوە لەکۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵات ، بەبێ ئەوەی کەس هەست بەمەترسی بکات ! دووژمنێک کەس بە دووژمن و ڕەقەمی نابینی ! من پێت دەلێم دووژمنی سەرەکی دینەکەت و شارستانیەتت و کچەکەت و کلتور و دابن و نەریتتان ئەبێت ، بەناڕاستەوخۆش حکومەتەکانن بەرگریان لێدەکەن ئیتر تۆ دەس بگریتە کڵاوی خۆتەوە یان نا ئەوان جەنگی خۆیان دەکەن دژ بە نەوەکانت ! نەوەکانت لەبیر و باوەری خۆیان کاڵدەکەنەوە بۆ جیلێکی بێ هەست و بێ ڕۆح و ئاست نزم ،

جا باشترین شتیش ئەوەیە پێش بە ئەم جۆرە جەنگە بگری لەقۆناغی زوودا ! بەڵام ئەمە زۆر قورسە کاتێک حکومەتێک پشگیری بکات! کەواتا مەسەلەکە گەورەیە ! (حکومەت کار لەسەر دروستبوونی جیلێک دەکات پێچەوانەی دین و بۆچونی کۆمەڵایەتی و سروشت و مرۆڤایەتی!)
( یەکەمین هەنگاوی بۆ ئەم پلانە ژەهراویەش دەرهێنانی ژنە لەماڵەوە بۆ دەرەوە بەناو ئیشەوە ، وەک چۆن لەئەوروپا هەر بەم شێوە دەستی پێکرد دواتریش قۆناغ قۆناغ ئافرەتیان کرد بەسەگ! لە ئەگەری سەرکەوتنی ئەم پلانە  سەر زەوی تێکدەچێ ! چونکە خێزان نامێنێتەوە و شارستانیەت دەروخێ نەک ئیسلامی ( من پێم وایە دەمێکە شارستانیەتی ئیسلامیان ڕوخاندووە ، شارستانیەتی مرۆڤایەتیش دەڕوخێنن کۆمەڵێ بازرگان و سەرمایەدار و دەسەڵاتدار دەبنە کەڵەگا بەهۆیەوە هەموو کاڵاکانیان ساغەکەنەوە بەسەر خەڵکیدا ! خەڵکیش با لەناو حەزەکانی خۆیدا وەک ببێ بە ئاژەڵ ،

هەریەکێک لەم هێمایانە ئاماژەیە بۆ جۆرێکی نوێ لەسێکسکردندا لەکاتێکدا یەک جۆری سێکسمان هەیە کە لە نێوان نێر و مێدا دەکرێ
خوداش دەفەرمویت ئێوەم لە نێرو و مێ دروست کردوە

بە کورتی ، پرسی جێندەر ، بەهەموو پێوەرێکی ئەقڵی و زانستی و فکری و ئاینی و شارستانیەت و کلتور ، بریتیە لەو پرسەی کە هەموو سنوورێکی بەها و ئەخلاق ئەشکێنێت ، بەجۆرێک مرۆڤبوون بچووک ئەکاتەوە کە ئافرەتێک وتی من سەگم ئیتر ئەو سەگە و تەواو ،

# ئیسلام فێرت دەکات مرۆڤ بێت

لە مێژوودا نەبووە مرۆڤ هێندەی ئێستا بەکۆیلەکرابێت ، ڕۆژانە دەیان چیرۆکی جیاواز دەبینین لەسەر بەکاڵاکردنی ئافرەت لە دونیادا هەر لە بازرگانی کردن بەڕۆحی و جەستەی و تا ژیانی و چۆنێتی هەڵسان و دانیشتنیشی، کەی لەمێژودا هەبوە ئافرەت هێندەی ئێستا زەلیلی مۆدەو جوانکاری و جلوبەرگ و ئێکسسواراتی خۆی وماڵەکەی و شمەکێکی بێ بەهای میدیای بێ موراڵ و دراماو سەدان دەرد بوبێت؟؟

کاتێکیش دێنە سەرباسی ئیسلام دەڵێن بۆچی ئافرەت مارەیی بۆدیاری کراوە خۆکاڵانیە ؟بەڵکو ئافرەت لە ئیسلامدا ئازادە لەچۆنێتی مامەڵەکردن بەو مافە شەرعی و یاساییەی خۆی ، دەتوانێ سەدان مسقاڵ بکات، دەشتوانێ هیچ نەکات ، ئەوە بە ڕێککەوتنە نەک ناچارکردن ، هەزارانساڵیشە هەروابووە ، بەڵام بیریان چۆتەوە جگە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئافرەت لە هەموو ئاینەکانیتردا بەکارهێنراوو کاڵایە ، هەرگیز دیوتانە وێنەی ئافرەتی مسوڵمان بدرێ لە سەر کاڵاکان؟ لەسەر نایلۆنو قاپو جانتاو پێڵاوو مۆبایلو سابونو سان،،تین .ئەوان بەجۆرێک سروشتی ئافرەتیان شێواندووە تەنانەت هۆڕمۆنی ئافرەتی نامسوڵمان تەواو جیاوازە لە خانمێکی مسوڵمان، لە منداڵیەوە بەکاری دێنن تا دەمرێ بێ سەرپەرشت و بێ لانەو ئەم ماڵ و ئەو کافتریاو نایت کڵاب و بارِو مەلها دەکات .تەنانەت پیاوەکانی خۆشیان ئامادەنین ئەو ئافرەتانە بکەن بە خێزانیان ، ئەڵبەت خێزان دارِوخاوە تاکو تەرا ماوەتەوە دەمەوێ بڵێم ئیسلامە وای لە ئێمە کردوە مرۆڤ بین و لەم دونییا کاتیەدا وەک پاشا و بەبەهاوە بژین ،

# بەدرۆ خستنەوەی دژە ئیسلامییەکان

ئەگەر ئیسلام ستەمی لە ئافرەت کردووە ، بۆچی ئافرەتانی ئەوروپا موسڵمان دەبن؟ ئەم ئافرەتانە لە جیهان و ئەوروپای فول زانستی و دیمووکراسیدا بەکام شمشێر و فشارو زەبر و زۆرداری موسڵمان دەبن؟! ، میدیاکانی ئەوروپا سەرسام بوونە بەو ڕێژە زۆرەی مسوڵمانبوونی ئافرەتانی ئەوروپی بەشێوەیەک تەنها لە ( سویسرا ) لەیەک ساڵدا ( 33 ) هەزار ئافرەت مسوڵمان بوونە وە لە ( بەریتانیا ) نزیکەی ( 75 ) هەزار ئافرەت لەچەند ساڵێک مسوڵمان بوونە ..

گەر ئیسلام ستەم لەئافرەتان بکات ، ئەی بۆچی زۆربەی ئەوانەی دەبن بە موسوڵمان ئافرەتن؟؟

زۆر کات بێباوەڕان ئیسلام بەوە تۆمەتبار دەکەن کە ستەم لەئافرەتان دەکات بەڵام بەپێی ئامارەکان بێت بەپێچەوانەوەیە ئیسلام ئافرەتان ڕزگار دەکات لە ستەمی ڕۆژئاوا و ئەوروپا بەشێوەیەک کە ئافرەتانی ئەوروپا لەم یاسا و ڕێسا ستەمگەرایە پشت هەڵدەکەن دێنە ژێر سایەی ئارامی ئیسلامی پیرۆز لەوێ هەست بە ئارامی دەروون و گیان و بیروهۆش دەکەن ، بەڕێژەیەکی هێندە بەرز ئافرەتان ڕوو لەئیسلام دەکەن کە پێگە جیهانیەکان و ئەوروپیەکان سەرسام بوونە وە هەروەها توێژینەوە و بەدواداچوون لەسەر ئەوەی بۆچی ئافرەتانی ئەوروپا بەم شێوەیە زۆرە باور بەئیسلام دێنن؟ ،لەگەڵ ئەوەشدا بە پێی ماڵپەڕی ( ئیندیپێندێنت:) "The Independent"ی بەریتانی: سەرەڕای ئەو هەموو فشارە زۆرەی دەخرێتە سەر موسڵمانانی پیاو و ژن لەسەر سەرپۆش و پەچە لە وڵاتان ، وە سەرەڕای ئەوەی کە تەشویشێکی زۆری سیاسی و ڕاگەیاندنەکان لە سەر ئیسلام هەیە - دروستکردنی ( ئیسلامۆ فۆبیا ) -، کە دەیانەوێت وێنەی ئیسلام ناشرین بکەن لەبەرچاوی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی،

کەچی ڕێژەی موسڵمان بووە تازەکان هەمیشە ڕوو لە زیادبوونە، کە ئەمەیش وایکردووە توێژەران سەرسام بن بەم ڕێژە زۆرەی موسڵمانبوون لە ماوەیەکی کەمی ڕابردوودا، هەروەها بەپێی توێژینەوەیەکی ( Faith Matters ) کەباس لە گۆڕینی ئاین دەکات بۆ ئیسلام باس لەوەدەکات لەگەڵ ئەوەی میدیاکان( 32 % ) ی ئەو بابەتانەی لەسەر ئیسلام بڵاو کراونەتەوە لە ساڵی ( 2001 ) ـەوە بە تیرۆر یان توندڕەوییەوە بەستراونەتەوە ، ئەو ژمارە هەر بەرزبوەوە بۆ ( 62 % ) ، بەڵام خەڵک هەر مسوڵمان دەبێ نەیان توانیوە ڕێگری بکەن لە بڵاو بوونەوەی ئیسلام ، بە دوای بڵاوبوونەوەی جیهانی ( ئیسلامیزمێکی توندوتیژ ) ، موسڵمانانی ( بەریتانیا ) لە هەموو کۆمەڵگە ئایینییەکانی دیکە زیاتر ڕووبەڕووی چاولێکەتن و ڕەخنە و شیکردنەوە بوونەتەوە . کەچی سەرەڕای وێنە زۆر نێگەتیڤەکانی ئیسلام ، ساڵانە هەزاران بەریتانی ئاینەکە دەگۆڕن بەئیسلام.

سەرچاوە : (indepenenden) . وە بەپێی ڕاپۆرتێکی ( Daily Mail دەیلی مێلی بەریتانی ) بەناونیشانی

"Why ARE so many modern British career women converting to Islam

بۆچی زۆرێک لە ئافرەتانی هاوچەرخی بەریتانی ئاینیان دەگۆڕن بۆ ئیسلام "

بە وتەی ( کێڤین پرایس Kevin Brice ) لە زانکۆی ( Swansea University ) ی بەریتانی کە پسپۆڕە لە لێکۆلینەوەی گۆڕینی ئاینی سپی پێستەکان بۆ ئیسلام ڕونیدەکاتەوە و دەڵێت : " ئەوان بەدوای ڕۆحییەتدا دەگەڕێن ، بە مانایەکی بەرزتر ، و بەقوڵی بیردەکەنەوە

# کچ بە ڕەوشتی خۆماڵی ئیسلامی!

- هەموو کوردستان (١) کچی ئیسلامی تێدا نییە جگەرە بکێشێ، ئەوەیە سەقافەت.
- کچانی ئیسلامی کوردستان سەقافەتیان لە کوڕەکانیش زیاترە.
- دایك و باوکە ئیسلامیەکان گرنگی زیاتر بە کچەکانیان دەدەن.
- ئافرەت لە ئیسلامدا موراعاتی زیاتر کراوە تا پیاو.
- ئیسلام بۆدی گاردی بەلاشی بۆ ئافرەت فەرز کردووە.
- بژێوی ئافرەتیش واجبی پیاوە کە بەبێ منەت دابینی بکات.
- ئەو کچانەی باوانیان ئیسلامییە هەستی ئاسودەییان زۆرترە.
- باوانی ئیسلامی هەرگیز بە سەرخۆشی شەوان نەگەڕاونەتەوە.
- باوانی ئیسلامی ڕۆژێ لە ڕۆژان نێرگەلەیان بە کچ و خێزانیان دروست نەکردووە.
- لەناو ئیسلامیەکاندا تەنانەت جگەرە کێشانیش عەیبەیەو هەتا (١) بارەگای حیزبیشیان نییە تەپڵەکێکی تێدا بێ.
- ئەمەی کە ئیسلام لەسەر پیاو بۆ ئافرەت فەرزی کردووە و حسابی بۆ کردووە خەونی ئافرەتانی
وڵاتە بەناو پێشکەوتووەکانە
- بە فیلم و دراماکانتان تەنها ئەخلاقی خۆتان و ئەتباعەکانتان تێك دەدەن.!

بگەڕێنەوە بۆ دراما کوردیە پڕ ڕەوشتیەکان بۆ نموونە لە درامای بوکی ژێر دەواری ڕەشدا کوڕێ گەشت بە کچێ لە پەنهانێکدا کە باری گاکەی کەوتبوو وە پێی وت : کەنیشکە کوردەی ماڵ لە نۆ هەوار، ماچێکم پێ بە گا کەو بۆ بکەم بار.
کچەش وتی؛ نە تۆ بمێنی نە خاوەنی بار، چەفتەی ٧ برام چۆن ئەکەم لار.

خوێنەری ئازیز ، بەتایبەت خوێنەری ئافرەت کاتی ئەوە نەهاتووە درک بەو هەموو ڕێز و خۆشەویستی و بەهاو مافە بکەیت ؟ ، کاتی ئەوە نەهاتووە ئارامبگری لەسەر ناخۆشیەکانت ؟
خاتوونی جوان ببینە خوودا چ ڕێزێکی لێ گرتووی ، خۆ یەک تۆز بە ئنساف بن هەموو مولحیدەکانیش انشاء الله بەم کتێبە ئەگەڕێنەوە سەر ئاینی ئیسلام کە ناسراوە بە ئاینی شکانی بتە خوڕافیەتەکانی مێشکتان و ئەو ئاینەی کە بۆخۆی مەنهەجێکە و دایکی هەموو زانستەکانە ،
هەڵبەتە کتێبی زۆرمان دەبێت تا ئەو کاتەی لەژیان دەبم هەوڵدەدەم تا ئەو کاتەی ئەمرم جوانیی و ڕاستیەکانی ئیسلام ئاوها بە بەڵگەوە بسلەمێنم بەڵام عەجەب ! عەجەب چ داخێکە کە جوانی ئەم ئاینە ئەوەندە زۆرە سوێن بەخووا دەبێت 70 نەوەی منیش لەسەر ڕێبازی من بڕۆن ئینجا قەترەیەک ئاو لە زەریای ڕاستیەکانی ئیسلام وەدەردەخەن ، خوداش یەکەم ئایەت لە سوڕەتی علق لەئایەتی 1 تا 5 کە دەڵێت بخوێنە ،
کە بۆخۆی ئەو ئایەتە سەلماندنی ڕاستی و دروستی ئاینی ئیسلامە ، وە ئەگەر تێبگەیت لەو ئایەتە بۆت دەرەکەوێت ئەوە یەکەم تەحەدای مرۆڤایەتیە بەرامبەر ئیسلام ، چوونکە لەگەڵ خوێندنەوە و بیرکردنەوە و گومان و پرسیار وردە وردە مرۆڤ دەگات بە ڕاستیەکان ، وە ئاینی ئیسلامیش چوونکە ئاینێکی ڕاست و بێ فرت و فێڵە بۆیە یەکەم ئایەت بێمنەتت ئەکات لە خوێندنەوە بگرە واجبیشی ئەکات ! ، تەنها بە ئنساف بە واتا درک بەڕاستیەکان بکە و خۆتیان لێ مەدزەوە ، سوێن بە پەروەردگار هەموو ئەقیدەی ئاینەکانی تریش وەک ناوی خۆت بزانی هەر ئەگەڕێیتەوە سەر ئاینی ئیسلام ،
پاکی و بێگەردی بۆ الله ، نازانم خوودا چۆن سوپاست بکەم ؟؟

# بۆچی ئاینی ئیسلام باشترین پێوەرە؟

ئەزانی بۆچی ئیسلام باشترین مافی بە ئافرەت و شتەکانی تری دونیا بەخشیووە ؟ ، چوونکە ئەم ئاینە ئاینی خوودایە ، خوداش دروستکەری هەمووومانە ، مادام خۆی دروستی کردوون ، بێگوومان هەر خۆشی ئەزانێت چی بۆ ئێمە باشە و چی بۆ ئێمە خراپە ، وەک چۆن ئەگەر شەربەتێک لەلایەن کۆمپانیایەکەوە دروست بکرێ کۆمپانیاکە لەبەشی پشتەوەی بوتڵەکەدا ئاماژەی پێکردووە کە لەچی و چی دروست کراوە و تەنانەت ئاماژەی بەوەش کردووە کە ئەبێ لە چ پلەیەکی گەرمی بێ ئەگەرنا تێ ئەچێ ، ئەم کۆمپانیایە بۆیە هەموو شتێک دەربارەی ئەم شەربەتە ئەزانن چوونکە خۆیان دروستیان کردووە ..... لەم کتێبەدا تۆی خوێنەرمان بەهەموو بەڵگەیەکی ئەقڵی و فکری و زانستی و ئاینی و شارستانیەت و ئامار ، بەهەموو ئەم بەڵگانە سەلماندمان کە ئاینی ئیسلام ئاینێکی ڕاستە ، وە باشترین پێوەریش پێوەری خوودایە کە بەبەڵگەوە سەلماندوومانن ، کاتی ئەوە نەهاتووە تۆی خوێنەر هەڵبستی و سووجدەیەکی شوکرانە بۆخوودا بەریت ؟ ، کاتی ئەوە نەهاتووە ئیتر تۆی خانم ببیت بە باڵا پۆش و بەتەواوی هەموو فەرمانەکانی خوودا لە ئاینی ئیسلامدا جێ بەجێ بکەیت ؟ ، با ئیستاش لە پرسی جێدنەری پیس و فێمینزمی هیچ و ئاینە دەسکاری کراوەکان و وڵاتە بەناو پێشکەوتووەکان و مێژووی پڕ لەخوێناوی گەردوون دەربچین ، کەمێک بچینە ناو ناوەڕێکی
جوانی و پاکی ئاینی ئیسلام ، لەڕێگەی سەرچاوە ڕاستەقینەکانەوە کە بریتین لە قوورئان و فەرمووده ، لەدوای ئەم پەڕەیە گوزەرێک بەناو ئایەت و فەرموودەکانی ئاینی ئیسلام ئەکەین
بفەرموون بەردەوام بن لەخوێندنەوە ...

# شارستانی ئیسلام و بەهای ئافرەت

هەر لە ساتەوەختی دەرکەوتنی ئیسلام ، ئیدی ئافرەتان بوون بە خاوەن پێگە و پلە و ڕۆڵی خۆیان ، ئینجا بۆ یەکەم جار لە مێژووی مرۆڤایەتی لە جیاتی سووکایەتی و بە کەم سەیرکردن و ئەشکەنجە و ئازاری جەستەیی و دەروونی ، ئافرەتان بوون بە خاوەنی ڕێز و مەقامی بەرز ، مەگەر دەگونجێ ئەم گەورەییە ڕوو لە شان و شکۆی ئافرەتان نەکات؟؟ لە کاتێکدا قورئانی مەزن پیرۆزترین پەرتووکی خوایە

لێوان لێوە لە باسکردنی گەورەیی و شکۆ و جوانی و ڕێزی ئافرەتان ، ئایەتە دانسقەکانی قورئان بۆ یەکەم جار بوو بە گوێی مرۆڤەکاندا بچرپێنن کە پێویستە ئیتر ڕێز و خۆشەویستی و جوانڕەفتاری و میرات و مافی ژیانێکی سەربەرزانە بدرێ بە ئافرەت ، ئەمەش وەک ماف و شایستەی خۆی نەک چاکە لەگەڵ کردن لەلایەن ڕەگەزی بەرانبەرەوە! ، ئایەتە ناوازەکانی قورئانی مەزن سەبارەت بە مافی ئافرەتان تەنها لە چوارچێوەی داواکاری نەبوو ، یاخود بابەتێکی ئەخلاقی بن ، یان چەند ئامۆژگارییەک بن و بەس ، بەڵکو یاسا و شەرع و پابەندکارە ، پێویستە لەسەر کۆمەڵگا پێیانەوە پابەندبن ، چونکە فەرمانەکان لەلایان خوداوە هاتوون ، پاداشت و سزای لەسەرە، وە بنچینەکەی سەیرکردنی ئافرەتە وەک (مرۆڤ).

بە تێڕامان و سەرنجدان لە ژیاننامەی سەرداری مرۆڤایەتی ﷺ، دەبینرێ چۆن ئەم مرۆڤە مەزنە بە کردار و گوفتار، لە هەوڵی بەردەوامدا بووە بۆ گۆڕینی داب و نەریتە خراپەکانی کۆمەڵگا ، لە بارەی خراپ ڕەفتارییان لەگەڵ ئافرەتان.. هەروەک لە نێوەرۆکی ئەم کتێبە فەرمووده و گوفتارە بەپێزەکانی ئەم زاتەت ﷺ بەرچاو دەکەوێ دەربارەی ئافرەت، ئەم زاتە مەزنە ﷺ لە ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەربازی و ئابووریدا هەمیشە هەوڵی بەخشینی پێگەی تایبەتی داوە بە ئافرەتان ،

بەم چەشنەی لە هەمان ئەم کۆمەڵگایەی کچ دەبووە مایەی شەرمەزاری بێ بۆ باوک و بەزیندوویی زیندەبەچاڵ دەکرا ، مرۆڤێکی پەیامدار دەرکەوت ﷺ موژدەی بەهەشتی دەدا بەو پیاوانەی کچ بەخێو دەکەن و پەروەردەیەکی جوانیان دەکەن، بەم جۆرە پاڵپشتی ڕێز و خۆشەویستی بوو بۆ ئافرەتان, بەڵێ، هەر کاتێک فاتیمەی کچی هاتبا لەبەری هەڵدەستا ، نێوچاوانی ماچ دەکرد ، شوێنی خۆی بۆ چۆڵ دەکرد و دایدەنیشاند ، کە تەنانەت بۆ هیچ پیاو و هاوەڵێکی ئەوەی نەدەکرد، هەروەها دەیفەرموو ﷺ:

«فَاطِمَةُ بَضْعَةٌ مِنِّي فَمَنْ أَغْضَبَهَا أَغْضَبَنِي»

(١), واتە: فاتیمە بەشێکە لە من، ئەوەی تووڕەی بکات و ئازاری بدات، ئەوە منی تووڕە کردوە و ئازاری داوم، هەموو ئەم هەڵوێست و وتانەی لەنێو مرۆڤایەتییەکی دڵڕەق و دڕندە دەرهەق بە ئافرەتان دەفەرموون و پەخش و بڵاو دەبوونەوە، ئەو ﷺ لە جێگایدا تۆوی خۆشەویستی و ڕێزی ئافرەتانی دەچاند ، چونکە ئەو ﷺ خۆی تاکە سەرکردەیە هەرگیز لە ئافرەتی نەداوە ، هەمیشە بە جوانترین شێوە مامەڵەی لەگەڵدا کردوون! لە حەجیماڵئاواییدا وەسیەتی ئەم پەیامبەر و سەرکردەیە باسی میرات و تەخت و جێنشینی و سەروەت و سامان نەبوو، بەڵکو باسی جوانڕەفتاری بوو لەگەڵ ئافرەتان، ئەوەبوو پڕ بە گەرووی موبارەکی دەنگی هەڵهێنا و سێ جار فەرمووی: (وەسیەتتان پێدەکەم بە جوان مامەڵەیی لەگەڵ ئافرەتان! لە نێو خۆشتان یەکتر ڕابسپێرن بە چاک مامەڵەکردن لەگەڵ ئافرەتان)! ئا ئەمە بۆ یەکەمجار بوو دوورگەی عەرەبی بە مرۆڤ و ژیاندار و هەرچی هەبوو گوێبیستی ئەم وتانە بن بۆ مافی ئافرەتان، سەرداری مرۆڤایەتی ﷺ خاوەنی سەدان فەرموودەیە کە هەر هەمووی بەڵگەیە بۆ داکۆکیردن لە ماف و ڕۆڵ و پێگە و بە گرنگ سەیرکردنی ئافرەتان، بەرهەمی ئەم وتانە بوو کە لە پشتییەوە ژیارێکی مەزن هاتە بوون ،

لە جوانترین تایبەتمەندی ئەوە بوو کە بۆ یەکەمجار بوو کە مامەڵە لەگەڵ ئافرەتان دەکرا وەک مرۆڤ! بۆیە زانایانی ئیسلام نووسین و توێژینەوەیان تەرخان کرد تایبەت بە ماف و هەق و پێویستییەکانی ئافرەت، نەوەک تەنها وەک بونەوەرێکی مێینە سەیر بکرێ ، موڵک و خانوو و کاڵایەک بێ بەکرێ بدرێ و کڕین و فرۆشتنی پێوە ئەنجام بدرێ ، لای نێرینەی گورگ ئاساکان بەکاربهێنرێ بۆ چێژێکی کاتی ، پاشان لە کاتی پیری و لە بێکەسی و بێنازیدا پەڕاگەندەی کوچە و کۆڵان و شەقامەکان بکرێ، وەک ئەمڕۆ خۆمان ئەم واقیعە تاڵە دەبینن! بەم شێوە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بوو بە هەڵگیرسێنەری شۆڕشێکی مەزن بۆ دەستەبەرکردنی ماف و هەق و پێگەی بەرزی ئافرەتان، ئافرەتانیش ئەم هەوڵە جوانەی ئیسلامیان پشتگوێ نەخست ، بەڵکو بەم ئازایەتی و بوێرییەی ئیسلام پێی بەخشین ، دەستیان کرد بە بەرجەستەکردنی ڕۆڵی پێشەنگایەتی ، لە سەرجەم کایەکانی ژیان توانیان ئاڕاستەی ژیانی مرۆڤایەتی بگۆڕن، ڕۆڵی وەرچەرخان ببینن لە زۆربەی مەیدانەکانی ژیان لە بواری زانست و زانیاری و سیاسی و خێزانداری و سەرکردایەتی و بونیاتنان و پەروەردەکردنی دەیان سەرکردەو پێشەنگ,,, هتد, گەر بمانەوێ لێرەدا ئاماژە بە ئافرەتە هەڵکەوتوو و دانسقەکانی نێو کۆمەڵگای مسوڵمانان بکەین، دەبێ سەرتاپای کتێبەکەو بگرە زیاتریش تەرخان بکەین بۆ ئاماژە پێکردنیان، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها ئەوەندە دەڵێین لە مێژووی ئافرەتانی ئیسلام دەیان ئافرەت لەبواری جیاوازدا پێشەنگ و زانا بوون ، تێیدا هەیە جگە لەوەی خۆی ئافرەتێکی زانابووە بەڵکوو 88 زانای تریشی پەروەردە کردووە ئاخۆ ئەم 88 زانایەی تریش چەن سەد هەزار کەسیان فێرکردبێ و ئەم چەن سەت هەزارە چەندان ملوێنیان بەهۆکاری ئەم زاناییانەی ئافرەت پەروەردەی ڕاست و جیهانبینیەکی باشتر کردبێ و ئەو ملوێنەش چەند ملیاری تر !!!!!

# ئافرەت لە ڕوانگەی قورئان

(لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ) سورەتی.
(النساء)ئایەتی32
بۆپیاوان بەش هەیە لەوەی بەدەستی ئەهێنن وە
بۆ ئافرەتانیش بەش هەیە لەوەی بەدەستی ئەهێنن

(وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ) سورەتی (البقرة) ئایەتی227
وە بۆ ژنان هەیە بەسەر مێردیانەوە وەکو ئەوەی کە بۆ پیاوان هەیە
بەسەر ژنانەوە بەپێی دابوونەریتی (پەسەند)

(وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ) (النساء)ئایەتی 19
وە ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن بەچاکی (و ژیانیان لەگەڵ ببنە سەر )

هەروەها ئەگەر ژنانتان تەڵاقداو گەیشتنە کۆتایی عادەی
مانگانەیان، ئێوە (ئەی کەسوکاری ژن) مەبنە کۆسپ لە ڕێگەیاندا
ئەگەر ویستیان شوو بکەنەوە بە هاوسەرەکانیان، (یاخود ویستیان
شوویەکی تر بکەن)، کاتێک ئەوان لە نێوان خۆیاندا ڕەزامەندییان
نواند بە شێوەیەکی جوان، ئەم (فەرمان و ڕێنموویيانە) ئامۆژگاری
ئەو کەسانەی پێ دەکرێت لە ئێوە کە باوەڕی بە خواو ڕۆژی قیامەت
هەبێت، ئەو جۆرە ڕەفتار و کردەوانەتان جوانترو پەسەندترو
خاوێنترە، خوای پەروەردگاریش چاکتر ئەزانێت (چی خێرە بۆتان) و
ئێوە نایزانن و دەرکی ناکەن. سورەتی البقرةئایەتی﴿٢٣٢﴾

(وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ) سورەتی البقرة
ئایەتی (٢٣٦)
وەبەهرەمەندیان بکەن ( پێیان ببەخشن لە بواری ماددی و
مەعنەویدا ) بەپێی ئاست و ژینگەی ژیان

(أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ) سورەتی الطلاق الآية:6
(ژنانی تەڵاق دراو) بێنن و نیشتەجێیان بکەن لەو شوێنەی کە (خۆتان)

(فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً)سورەتی النساء  ئایاتی ٢٤
مارەییەکەیان پێ بدەن کەفەرز کراوە لەسەرتان

(وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ) سورەتی النساء ئایەتی ٧
وەبۆئافرەتانیش بەش هەیە لەو میراتەی دایک و باوک و خزمە نزیکەکانیان جێی دەهێڵن

(وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبْنَ) سورەتی النساء
ئایەتی٣٢
وە بۆ ئافرەتانیش بەش هەیە لەوەی بەدەستی ئەهێنن

(وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ سورەتی النور) ئایاتی ٣٣
وە لەو ماڵەی کە خوا بەئێوەی داوە پێیان بدەن.

(هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ)
سورەتی البقرة ئایاتی ١٨٧
ئەوان بۆئێوە پۆشاکن وەئێوەش بۆ ئەوان پۆشاکن ( گرنگی پۆشاک لەوەدایە کە جوانترت ئەکات و عەیبەکانت دادەپۆشێ!!)

(هَؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ)
سورەتی هود ئایاتی٧٨
ئەوانە کچەکانی منن (مەبەستی کچەکانی هۆزەکەی بوو)ئەوانە پاک و حەڵاڵن بۆتان

(فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً)
سورەتی النساء ئایاتی ٣٤
چیتر هیچ ڕێگەیەک لەدژیان مەگرنەبەر

(لا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهاً)
سورەتی النساء ئایاتی١٩
حەڵاڵ نییە بۆتان کە ئافرەتان بە زۆر و ناچاری ببەن بۆخۆتان

(وَلا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ) سورەتی النساء ئایاتی١٩
وە بەرگری شوکردنیان لێ مەکەن بۆ ئەوەی هەندێ لەو(مارەیی یەی)کە پێتان داون بیبەن (بۆخۆتان)

(وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالْأُنْثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ)
سورەتی النحل ئایاتی ٥٨
خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرایا بە یەکێك لەو نەفامانە پێش ئیسلام ڕووی گرژو تاڵ دەبوو و ڕەش دادەگیرسا و سینەی پڕ دەبوو لە خەم و پەژارە لە داخ و خەفەتی ئەو هەواڵە ناخۆشە ، خۆیان دەشاردەوە لە خەڵکی و بەتەنها بیریان دەکردەوە : ئایا بیهێڵێتەوە بە زەلیلی و سووکی و بێ نرخی ، یاخود زیندە بەچاڵی بکات و بیخاتە توێی خاکەوە ، ئاگاداربن؟! ئای کە چەندە خراپە ئەو بڕیارەی کە دەیدەن!! (وەچە و نەوەی خۆیان زیندە بەچاڵ دەکەن)

(وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا) سورەتی الأحقاف ئایاتی ١٥
ئێمە فەرمانمان بەئادەمیزاد داوە کە چاکەکارو چاک ڕەفتار بێت لەگەڵ دایک و باوکیدا، دایکی بەئازارەوە هەڵی گرتووەو بەدەم ئێش و ئازارەوە بوویەتی، بە سک پربوون ئەو پەڕی ئێش و ئازار

(مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً)
سورەتی النحل ئایاتی ٩٧
هەر کەس لە نێر یان لە مێ کردەوەی چاکی کردبێت وبیکات و بڕواداریش بوو بێت ئەوە سوێند بەخوا بە ژیانێکی خۆش دەیان ژیەنین

(مَّا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ)
سورەتی المائدە ئایاتی ٧٥
مەسیحی کوڕی مەریەم هیچ شتێک نییە (نە خوایە و نە کوڕی خوایە) جگە پێغەمبەرێکی خوا نەبێت، بە ڕاستی پێش ئەو چەندەها پێغەمبەری تریش ڕابوردوون، دایکیشی ئافرەتێکی زۆر ڕاست و ڕاستگۆیە،

(هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا) سورەتی الأعراف ئایاتی 189
خوا ئەو (زاتەیە) کە ئێوەی دروست کردوە لە یەک کەس کە (ئادەمە) هەر لەخۆی هاوسەری بەدی هێنا تالەلای بحەسیتەوە(ئارام بگرێ)

إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ
بەڕاستی پیاوە مسوڵمانەکان وئافرەتە مسوڵمانەکان

وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ
وە پیاوە باوڕدارەکان و ئافرەتە باوڕدارەکان

وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ
و پیاوانی هەمیشە گوێڕایەڵ و )ئافرەتانی هەمیشەگوێڕایەڵ)

وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ
و پیاوە ڕاست گۆکان و ئافرەتە ڕاست گۆکان

وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ
و پیاوان و ئافرەتانی خۆ گر و بەئارام

وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ
وە پیاوانی لەخوا ترس و ژنانی لە خوا ترس

وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ
وپیاوان و ئافرەتانی بەخشندە

وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ
و پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژوەوان

وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ
پیاوان و ئافرەتانی دوایێن پاک

وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ
پیاوانێ کەزۆر یادی خوا دەکەن و ئافرەتانێ کە
زۆر یادی خوا دەکەن

أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ
خوا ئامادەی کردووە بۆ هەموویان

مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا
لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە

سورەتی (الأحزاب )ئایاتی (35)

---

ئەمە ڕوبعێکی ئەو ئایەت و ڕێزە نییە کە خودا لە ئافرەتی گرتووە لە قورئاندە ،
ببینە بزانە قورئانەکەی خوودا چ دیوێکی قوڵی ڕێز و ماف و جوانی و بەها و
شکۆیە بۆ ئافرەتێک کە یەک تۆز بەخۆیدا بچێتەوە!!
هەر ئێستا سووجدە بۆ خوداکەی خۆت ببە لەبەرامبەر ئەو هەموو ڕێزە!

# ئافرەت لە ڕوانگەی فەرموودەدا

تێبینی // ئەم فەرموودانەی کە دانراون لە 15% ی ئەو فەرموودانەن کە دەربارەی ئافرەت هاتوون ، کە تەواویان بۆ خزمەتکردن و بەرزکردنەوەی بەهای ئافرەتن ..

(السَّاعي على الأرملة والمسكين كالمجاهدِ في سبيل الله أو كالقائم لا يَفتُر، أو كالصائم لا يُفطر)

واتە یارمەتی دانی بێوەژن و هەژاران وەک و تێکۆشان وایە لەپێناو خودای گەورە یاخوود وەک و ئەوکەسەی شەونوێژ ئەکەن بەبێ ئەوەی هیلاک بن یاخوود وەک ئەوکەسەی بەڕۆژووبێت بەبێ شکاندنی

(هل لك مِن أُمٍّ؟) قال: نعم، قال: (الْزَمْها؛ فإنَّ الجنة عند رجليها) واتە دایکت هەیە وتی بەڵێ پێی فەرمووی خزمەتی بکە چونکە بەهەشت لەژێر پێیەکانیدایە .

(الأيِّمُ أحقُّ بنفسها من وليِّها، والبِكر تُستأذن، وإذنها صَمتُها)

واتە ئەوئافرەتەی شووی کردووە بەڵام مێردەکەی مردووە هەرکات ویستی شووبکا یان بێتە داوای ئەوکاتە ئەتوانێ پێش ئەوەی کەس وکاری بڕیار بدەن خۆی ئەتوانێ بڕیارِ بدا بەڵام بۆکچی ئەعزەب پێویستە کەس وکاری بڕیار بدەن

(ما اكرمهن الا كريم وما اهانهن الا لئيم )

واتە خاوەن ڕێزە ئەوکەسەی ڕێز لەئافرەت ئەگرێ  و بێ ڕێزە ئەوکەسەی سووکایەتی بەئافرەت بکات

(خير أولادكم البنات)

واتە باشترین منداڵتان کچەکانتانن

- لەخوا بترسن لەسەر ئافرەتەکان چونکە
ئافرەت ئامانەتی خودان لای ئێوە!!

- بۆ مووسڵمان نیە شتێکی خێزانی بەدڵ نەبێ لەکاتێکی سیفەتی جوانتری هەیە

- باشترینتان ئەوەیە لەگەڵ خێزان و منداڵەکانی باش بێ

- لەسەر ئێوەیە ڕزق و ڕۆزی وجل و بەرگیان بۆپەیدا بکەن

- باشترین پارە ئەوەیە خێزان ومنداڵی خۆت سەرفی بکەی

- لەدڵ خۆشی پیاو ئەوەیە خێزانێکی باشی هەبێ

- ئافرەت شوانە بەسەر ماڵی پیاوەکەی بەرپرسە لەسەر ماڵ و مێردی

- داواکاردنی زانست واجبە لەسەر هەموو مووسڵمانێک
خۆشەویست کراوە لام ئافرەت و چاکە کاری و نوێژیش کراوە بەبیلبیلەی چاوەکانم

- تەواوترین بڕوادار ئەوەیە جوانترین ڕەوشتی هەبێ
لە ئەمانەتەکانی خودا مەدەن (ئافرەت)

- هەرکەسێ دوو کچۆڵە بەخێو بکا تاوەک وگەورە بن ، لەڕۆژی دوایدا لەگەڵ
مندا دەبێ (پاداشتیان بەهەشتە)

- هەرپارویەک ئەیکەی بەنەفەقەوو مەسروفی منداڵەکانت ، بەچاکەو سەدەقە
بۆت دەنوسرێ

# سەرچاوەکان

بۆ ئەوەی خوێنەر نەکەوێتە دوودڵی لە ڕاستی و دروستی بابەتەکان ، بفەرموون ئەوەش سەرچاوەی تەواوی ئەو ئامارانەی کە دانراون ، لەحاڵەتێکدا ئەگەر سەرچاوەیەکمان بیرچووبوو ، دڵنیابن لای خۆمان تەواوی سایت و ماڵپەڕەکان بە لینک و ناو بوونیان هەیە ، لەحاڵەتی لەبیرچوونی هەر سەرچاوەیەک دەتوانن لەڕێگای سۆشیال میدیاوە ئاگادارم بکەنەوە

بابەت
ڕێژەی دەسدرێژی سێکسی ناشەرعی منالّی ناشەرعی - statista infograghic

---

لەباربردنی منداڵ لە ئەمریکا nationmaster

---

بوونی کۆیلە لە وڵاتە ئەوروپیەکان RFI

---

فرۆشتنی کچان لەئەمریکا بەئۆنلاین JUSTPASTE

---

وەزیری بەرگری ئەمریکا باسی کارەساتی دەسدرێژی دەکات لە ئەمریکا vaterans affairs

---

وەزارەتی فێرکردنی ئامریکا
باسی دەسدرێژی ئافرەتان دەکات
کە لە خوێندگاکاندا دەکرێتە سەریان
www.ed.gov/rschstat/

---

ئاماری دەسدرێژی کردنە سەر ئافرەتانی پەرستار لە ئەمریکا و لە تایوان

سەرچاوە :پەیمانگای نیشتیمانی تەندروستی سەر بەوەزارەتی ئەمەریکا

دەسدرێژی کردنە سەر کچانی یەکێک لە قوتابخانەکان بەناوی (ئەوهاهیو)
alarabya.net

---

نەخۆشکەوتنی ئافرەتان بەهۆکاری سێکس
CNN

---

دانپێدانانی کۆمەڵگای وڵاتان لە بوونی خیانەت بەرامبەر هاوسەرەکانیان
BBC | news

---

خیانەتی پیاوی هاوسەردار بەرامبەر 15 ئافرەتی تر لە ئەمەریکا
CDC

---

بەرزترین ڕێژەی سکپڕبوونی ئافرەتان لەوڵاتانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا
سەرچاوە : وەزارەتی تەندروستی ئەمەریکا

---

دەستدرێژی کردنە سەر خانمانی فەرمان بەر لەبەریتانیا
سەرچاوە : دەیلی مەیلی

# بەناوی خوودای گەورە و میهرەبان

## بابەت // داواکاری

داواکارییەکی زۆر گرنگم لە تۆی خوێنەر هەیە ، خوێنەری ئازیز ئەم کتێبە کە ئێستا بەرێزت بە PDF ئەیخوێنیتەوە پاش سێ مانگی داهاتوو چاپ دەکرێ و بوودجەیەکیش بۆ بڵاو کردنەوەی تەرخان ئەکرێت ، جا ئەمەوێت لە چاپی کتێبدا و لەچاپەکانی داهاتوودا گۆڕانکاری گەورە و مەزنی تێدابکەم ، بۆیە تکایە فیدبەیک و سەرنج و پێشنیارەکانتان بۆ ئەم سۆشیال میدیایانە بنێرن ، کە ئایا هەڵەیەکی تێدایە ؟ ئایا بابەتێکمان پەڕاندووە ؟ ئایا هیچ بابەتێک هەیە لەوەی کە باسکرابێ پێت وابێ هەقی خۆمان پێ نەداوە ؟ ، تکایە هاوکارمان لە باشتر گەیاندنی پەیامی الله ،


abdulla_dara

عبدالله دارا

07505290334

abdulla_daraa


لەگەڵ ڕێزی نووسەران
عبدالله دارا
مەبەست نەوزاد

بۆ خوێنەر و ڕۆژنامانووس و ڕاپۆرتەرە ئەکادیمیەکان
سەرچاوەی ئامارەکانی پێشوومان لە دوای ئەم پەڕەیەوە داناوە

# کورتە پەیام




کتێبی
بەهای ئافرەت لەئاینی ئیسلامدا
بەراورد بەئاین و ژیار و کۆمەڵگا و وڵاتە پێشکەوتووەکان و بەراورد بە مێژوو و ئامار و زانست و فکر بەراورد بە شارستانیەت
لە تایبەتمەندییەکانی ئەم کتێبە : هەر باسێکی ئاینی و ئاماری تێداکرابێت بەبەڵگەو سەرچاوەی ڕاستەقینە ئاماژەیان پێکراوە ، بەزمانێکی سادە نوسراوە تا هەموو ئاست و چینەکان لێی تێبگەن ، دیزاینی ناوەوەی کتێب لەڕووی ڕەنگەوە بەجۆرێکە کە چاوی خوێنەر ئەزیەت نادات ، ئەم کتێبە بەرهەمی دەیان ساڵ ئەزموون لەنووسین و شەونخوونی و گەڕانی ورد و درشتبووە ، تاکە ئومێدم ئەوەیە خوودا لێمی وەرگرتبێ ،

سەرنج و پێشنیارەکانتان بۆ پەڕەی سۆشیال میدیا بنێرن تا لەچاپەکانی ئایندەدا بە گۆڕانکاری گەورەو مەزنەوە
دووبارە بڵاوی بکەینەوە

